

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- شیعری ژنانی جیهان
- توێژینەوە و وەرگێڕانی: لەیلا ساڵحی
- نەخشەسازی ناوەوە: باران
- بەرگ: جێگر عەبدولجەبار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ٥٠٠
- نرخ: ٥٠٠٠
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٢٠٩) ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب ( ١٥٠)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەرۆک

# پێشەکی

دابەشکردنی شێعر بە ژنانە و پیاوانە؛ واتە بە پێی ڕەگەز و لە ئاکامدا بە چاوێکی بایەخدانەرانە و وردبوونەوە لەو بابەتە، ڕەنگە لەگەڵ ویست و زەوقی ئەدەبی زۆر کەس یەک نەگرێتەوە. چون ئەوەی ئێمە وەک خوێنەری جیددی شێعر دەبێ بە دواوەی بین، خودی شێعرە نەک ڕەگەزی نووسەرەکەی. یەکێک لەو بابەتە گرینگانەی کە لە جودایی شێعری ژن و پیاودا زۆر بەرچاوە، ڕاوێژی دەربڕین و زۆر جار ئاراستەی فیکری و فەلسەفی تایبەتە، کە ئەویش دەگەڕێتەوە سەر جۆری ژیان و ئەو شتانەی لە جیهانژینگەی هەرکامیانەوە نزیکترە. ئەو جۆرە جیاوازی‌یانەش لە شێعری هەموو شاعیراندا؛ لە ژن و لە پیاو، بە پێی ڕەوت و ئەزموونی ژیانیان ئاسایی‌یە. من لێرەدا مەبەستم نییە بە دوور و درێژی باسی جودایی یا تەبایی نێوان شێعری ژنان و پیاوان بکەم. ڕەنگە هەر لەو کتێبەدا زۆر دەقی ڕەخنەیی وا هەبن کە تا ڕادەیەک ئاوڕیان لەو بابەتە دابێتەوە. ئەوەی لێرەدا گرینگە ئەوەیە؛ کە من وەک ژنێکی شاعیر تا ئێستا خۆم بە شوێن شێعرەوە بووم و هەرگیز بەو چاوە تەسکبینەوە لە ئەدەبیاتم نەڕوانیوە کە جەغزی

بۆ دیاری بکەم. بەڵکوو بە شوێن دەقەوە بووم. دەقێک کە چێژ و دەربڕین و دارشتن و...ی شاعیرانە بێت. بەلام هەر لەو گەڕانەشمدا زۆر جار کە دەگەیشتمە شاعیرانی بە توانای ژن و دەقەکانیانم دەخوێندەوە، بەردەوام جۆری روانینی ئەوانم بۆ ژیان و دونیا پێ تایبەت بوو، من لێرەدا دەڵێم تایبەت، نەک بە شێوەیەکی بایەخدانەرانە، بەڵکوو بە وردبوونەوە لە دونیای رووحی شاعیرانی ژن ئەو جیاوازیی‌یەم وەک دەربڕین و جۆری روانین دۆزییەوە. هەر چەند ئەو تایبەتمەندی‌یە لە دەقی هەموو شاعیرانی ژندا هاوشێوە نییە و زۆر شاعیری ژنی واش هەن و بوون کە راوێژ و تەنانەت جۆری روانینیشیان لە دونیای پیاوانە نزیک بووە و شاعیری چاکیش بوون. ئەوەی لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە کە من حەولم داوە لە کۆنترین شاعیرانی ژنی جیهانەوە تا شاعیرانی هاوچەرخ و لە رۆژئاوای دونیاوە تا رۆژهەلات، هەر ژنە شاعیرێکی بە توانام ناسیبێ و دەقەکانیم وەدەست کەوتبێ، حەولم داوە کاریان لەسەر بکەم و وەریان بگێڕم. هەر بۆیە زۆر شاعیری بە توانا و خاوەن شێوازی وەک؛ " سیلویا پلات"،"تسوی تایوا"، "ئاخماتوا"، "دیکنسۆن"، "شیمبۆرسکا"، "دیمیتروا"، "مارگۆت بیکێل"، "هانا گرزانیک"، "فالکێن لەند"، "مارگارێت ئەتوود"، "زنائیدا هیپووس"، "سیلوا گابوودیگیان"، "مایا ئانجێللۆ"، "سودرگران"، "سافۆ"، "ئینهیدۆنا"، "ئەگنێس نمێر ناجی"، "شووشانیک" و

دەیان شاعیری دی، کە دەنگیان لە هەموو جیهان دا بیستراوەوە و کتێبیان بە هەموو زمانان وەرگێڕدرواه، جێگایان لە زمانی کوردی دا بەتاڵ بوو. پێشتر لەو شێوە کارە لە نێو فارسەکاندا کراوە، بەڵام ئەو هەڵبژاردەیەی لە بەر دەستتان دایە، جیاوازی لەگەڵ ئەو جۆرە کۆ شێعرانە ئەوەیە کە وەکی کوتم لە کۆنترین شاعیرانی ژنەوە کە تەمەنی شێعرەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ چەندین سەدە بەر لە زایین، هەتا شاعیرانی ئێستام تێدا کۆ کردۆتەوە. لەباری جواغرافیاییشەوە دەتوانم بڵێم شاعیرانی ژنی زۆربەی وڵاتانی دونیا، دەق و ژیانیان لێرەدا خراوەتە بەر دەستی خوێنەری کورد. لە لایەکی دیکەشەوە من بۆ دەقی زۆربەی شاعیرەکان لە چەندین سەرچاوە کەڵکم وەرگرتووە و تەنیا وابەستەی یەک سەرچاوە نەبووم و لە زۆریشیان دا ئەوەندەی لە توانام دابووبێ بەراوەردی دەقە سەرەکییەکەشم کردووە. بەڵام لە راستیدا من ئەو کۆ دەقەم لە فارسییەوە وەرگێڕاوە. لە کۆتاییدا ئەوەندەش بڵێم کە رەنگە زۆر بە دەگمەن کۆ دەقێک لە شاعیرانی ژن یان پیاو بڵاو بووبێتەوە کە هەر هەموویان بە تەسەلی باس و شیکاری شێعر و ژیان و ئەزموونی شاعیرەکانی تێدا کرابێ. لەو کتێبەدا حەول دراوە جگە لە چەند شاعیر، هەموو شاعیرەکان خوێندنەوەیەکی تەسەل لە سەر شێعر و ژیانیشیان بنووسرێ یان وەربگێڕدرێ. بەو واتایەی کە تاقمێک لە

شاعیرەکان کە وتار و نووسراو لە سەر ژیان و شیٚعریان لە بەر دەستدا بووە، ویٚڕای چەپکێک لە شیٚعرەکانیان وەرگیٚڕدراوە، تاقمێکی دیکە لە شاعیرەکان کە وتاری سەربەخۆ و تەسەل لە سەر شیٚعر و ژیانیان لەبەر دەستدا نەبووە بە دۆزینی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان و کۆکردنەوەی زانیاری پێویست و لێکدانەوەی شیٚعریان، وتار لەسەر بەرهەم و ژیانی ئەدەبی‌یان ئامادەکراوە. لە کۆتایی‌دا هیودارم ئەو حەولەم بتوانێ سوودێکی بۆ خوێنەرانی بەڕێز هەبێ و لە داهاتوو دا بە پشتیوانی ئێوەی خۆشەویست بەرگی دووی ئەو کتێبەش بخەمە بەر دەستی خوێنەران.

**لەیلا ساڵحی**

هەزار و سەد ساڵ بەر لە "سافۆ" (Sappho) و هەزار و حەوت سەد ساڵ پێش "هۆمێر"، لە شاری ئوور (ur) کاهینێک بە ناوی "ئینهیدۆنا"(Enheduanna) دەژیا. ئەو هەر ئەو کەسەیە کە هۆنراوەی بەرزی"ئینانا، خاتوونی گەورەترین دڵی"(١)هۆندۆتەوە. ئەو بەرهەمە کۆنترین شێعری جیهانە. تا ئەو جێیەی بۆمان دەرکەوتووە شێعرەکەی"ئینهیدۆنا" یەکەم شوێنەوارێکە کە لەسەر سواڵەتە سومێرییەکان نووسراوەتەوە، کەوایە لانیکەم تا کاتێک شوێنەوارێکی کۆنتر نەدۆزرێتەوە، دەبێ ئەو شاعیرە وەک کۆنترین شاعیری جیهان بناسین. "ئینهیدۆنا" هەر ئەو خاتوونەیە کە ئەویندارانە "ئینانا"ی ستایش دەکرد و هەر بەو هۆیەش ئەم شێعرە جوان و ناسکەی بۆ کوتووە. بەڵام لە نێوان ستایشی ئەو شاعیرە لە "ئینانا" و شوێنەوارگەلێک کە دواتر "حەووا" هەڵدەسەنگێنن و یەکەمین گوناح لەورا دەزانن، جیاوازییەکی بەرچاو هەیە. "حەووا" بە هۆی بەجێنەهێنانی ئەمری خوداوەندی میری مەزن، غەزەبی لێدەگیرێ و بە سەرشۆڕییەوە گەڵا دەپۆشێ و لە بەهەشتەوە بەرەو تاراوگە دەنێردرێ. لەکاتێکدا "ئینانا" نەک هەر تەنیا لەبەر توانای بەدیهێنانی وەرزێڕی، بەڵکوو لەبەر خاتری "یوونی"ش(٢) کە دیاردە و نیشانەی بەروبوو و زاوزێیە ستایش دەکرێ.

"ئینهیدۆنا" کاهینی دەوڵەت-شارێکی دەشتەکانی نێوان دیجلە و فۆرات بوو. شوێنێک کە بە بێشکەی ژیار ناسراوە. هەڵبەت بەر لەو رێکەوتە ژیارەکانیش وەک باقی خەڵکی تر، بە شوێن وەدەستهێنانی بژیوەوە کۆچەر

بوون، لانیکەم لە چل هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە تا هەزارەی پێنجەمی بەر لە زایین، ژیاری "نێوانچۆمان"(Mesopotamia) واتە مەودای نێوان دوو چۆمی دیجلە و فورات، لە دەشتەکانی نێوان زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس و چۆمەکانی دیجلە و فورات، دادەمەزرێ. سوومێرییەکان لە ریزەی هەوەڵ دەوڵەتەکانی ئەو ژیارە بوون و رەنگە هەوەڵ شارستانیەتێک بووبێتن کە داهێنەری خەت بن. هەر لەوەش رایە کە شێعرەکانی "ئینهێدۆنا" بە خەت و زمانی سوومێری نووسراوەتەوە.

شێعری "ئینهێدۆنا" رۆڵێکی یەکجار گرینگی لە پێکهاتنی پێکهاتەی ئەدەبیاتی جیهاندا بووە. وەرگێرانی ئەو شوێنەوارە کە لەو ساڵانەی دواییدا ئەنجام دراوە، ئەو بابەتەمان بە روونی بۆ دەردەخا. شوێن دانانە سەرسوورهێنەرەکەی تا ئەو رادەیەیە؛ کە دەکرێ بڵێین دەنگە گرینگ و سەرکەوتووەکانی رابردوو، هەموو لە ژێر تیشکی شوێنی ئەودا بوون بە یەک و ئەدەبیاتیان بە درێژایی مێژوو بەرەوپێش بردووە. لێکۆڵینەوە کەونارایی و بیناسازییەکان ئەم شوێندانان و هێڵی شکڵگرتنەی ئەدەبیات بە تەواوی دەسەلمێنن. بۆ وێنە کۆمەڵێک نووسراوە لەمەڕ بیناسازی شارەکانی "ئوور"، "تێرۆئا"، یان شوێنەوارە ئوستوورەییەکانی ئێران وەک "گەنگ دژ" لەبەر دەست دان، کە ئەو راستییە دەردەخەن. ئەم شوێنەوارانە، لە زۆر بواردا کاریگەرییان لەسەر ئەدەبیات داناوە. لەو نموونانە دەتوانین ئاماژە بە "هفت پیکر" بکەین. بۆ بەڵگەی تریش دەتوانین بڵێین پێکهاتە و

شێوەی قەڵا و باڵەخانە و شوێنەوارە کۆنەکانیش شوێنیان لەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکان داناوە.

تەنانەت شوێنەوارە کەوناراییەکانیش ئەم راستییە دەسەلمێنن. بە تایبەت شاعیران پێشاندەر و دەرخەری رێگایەکن کە تا ئێستا لە ئەدەبیاتدا بیراز کراوە و هاتوچۆی بەسەردا کراوە. لە فارسیدا وەک باسمان کرد "هفت پیکر" نموونەی رێکهاتنی کۆشکی "خەوەرنەق" و ئامانجشاری ئووستوورەییە. هەر وەک چۆن شیمانە دەکرێ مافوورره و قەڵای ئێرانیش مەبەستی دیسان نواندنەوەی ئەو شارەیان تێدا حەشار درابێ.

رێکهاتنی بابەتەکان لەگەڵ یەک، شیمانەی هەبوونی ئەم شوێندانانە بەربڵاوە بەهێزتر دەکەن. شوێن پێی ئووستوورەکانی "نێوانچۆمان" لە سەرانسەری ئاسەواری فەرهەنگە جۆراوجۆرەکاندا نیشاندەری ئەو رەوتەیە. بۆ وێنە سەیر نییە کاتێک دەبینین وێنەی "ئینانا" لە چاخی پیاوسالاری و لە زۆربەی ژیارەکاندا، لە گەڵ گوناحی "حەووا" کە بە یەکەمین تاوان نێوی زراوە، تێکەڵ دەبێ. سەرشۆڕی "حەووا" نموونەی سەرشۆڕی ژن لە چاخێکی مێژوویی تایبەت دایە. ئەو نموونەیە وێڕای هێندێک نموونەی تر، چاخی بەهێزبوونی پیاو دەنوێنن، سەردەمێک کە ئێمە وەک چاخی باوکسالاری ناوی دەبەین و هەڵبەت ئێستاش بە شێوەیەک لە شێوەکان هەر لەو چاخەدا دەژین. بەڵام بەر لەو رێکەوتە بە پێی دیاردە و ئاسەواری جۆراوجۆر، بۆ وێنە چیرۆکە ئوستوورەییەکان، ئێمە لە چاخێکی دوور و درێژی ژنسالاری ئاگادار دەبینەوە. لەو چاخەدا، راست بەو

جۆرەی لە چاخی باوکسالاریدا دەبیندرێ، ئێمە شایەدی گازە و ستایشین بۆ ژن و "یوونی"یەکەی ئەو، کە وەک ئافرێنەر و دەوامدەری نەوەکان ناسراوە. سەردەمێک "سافۆ" و بەر لەویش "ئێنهێدۆنا"، ئەم گەڕانەوە بۆ دوایە؛ واتە لە باوکسالارییەوە بەرەو ژنسالاری، لە رەوتی ئەدەبیاتدا دەنوێنن.

بە دۆزینەوەی ئاسەوارەکانی "سافۆ" گۆڕانکارییەکی قووڵ لە جۆری روانین بۆ ئەدەبیات بەدی دێ. چون سەرەتا بۆمان دەردەکەوێ، نووسەرێکی ژن لە رابردووی زۆر دوورەوە و لە راستیدا چەند سەدەش بەر لە "هۆمێر" پێکهاتەی ئەدەبیات دادەڕێژێ و پاشانیش شێوە راونین و وێنەیەکی جیاواز لە ژن دەخاتە روو. بابەتی بەرباسی ئەو، خوداکان یان بە واتایەکی تر، ئوستوورە و ئایینەکانە، کە لە ناخی ئەوانەدا ژن و ئەوین دەترووسکێتەوە. شێوازی کارەکەشی ساکار و ئەویندارانەیە. "سافۆ" سەرنجی سەرەکی خۆی دەداتە خاتووخودای "وێنووس" لە فەرهەنگی لاتیندا، یان "ئافرۆدیت" لە زمانی یوونانیدا. خاتووخودایەک کە هەر وەک هاوتا ئێرانییەکەی خۆی "ئاناهیتا"، ئەستێرەیەکی هەر بەو ناوەوە هەبووە و ئێستاش هەیەتی. "سافۆ" مامۆستای گەورە کچان بوو، هەروەها کاهینێکیش بوو کە هەموو تەمەنی خۆی پێشکەش خاتووخودای "وێنووس" کرد. ئەو خاتووخودایە بەر لەویش هەبووە و لە ژیارەکانی "نێوانچۆمان"دا لە نێو "ئەکێدی"یەکان بە "ئیشتار" و لە نێو "سوومێری"یەکان بە "ئینانا" ناوی دەرکردووە. بە دۆزینەوە و وەرگێڕانی سواڵەتەکانی "ئێنهێدۆنا" لە دوو

دەیـــەی رابـــردوودا، بۆمـــان دەردەکـــەوێ ســـافۆش وەک خاتووخوداکـــەی "ڤێنـووس"، جێگـری شـاعیر و خـاتوو کـاهینێکی کۆنتر لـە خـۆی بـووە کـە ئـەویش "ئینهێدۆنایـە". هـەروەها لـە شـیعری "ئینهێدۆنـا"ش ڕا تێدەگـەین، تەنانـــەت "ئینانـــا"ش لـــە بـــەرزایی ئوســـتووره و قارەمانـــە کۆنـــە ئوستوورەیی‌یەکانەوە لە گەڵمان دەدوێ. هەر بۆیەش شاعیر ئاوەها ستایشی دەکا:

تۆ، تۆ بە عەبا لە مێژینەکانەوە

عەبای خودا لە مێژینەکان...

دۆزینەوە نوێ‌یەکان ئاوا دەگێڕنەوە؛ کە دەبێ ماکە شوێن‌دانەرەکان لـە ئـەدەبیات و لێکۆڵینـەوەکانی داهـاتوو، لـە نێـو چاخـە شـاراوەکانی پشـت تـەمومژی زەمـان ببینینـەوە. ئێسـتە کورتەیـەکی ئـەو توێژینەوەیـە کـە گەڕانەوەیەکە بەرەو دوا، دەخەینە بەردەست.

چەند سەدەی رابردووی ژیاری مرۆڤ یەکسەر لـە ژێر چۆکی رەخنـە و ئەدەبی یوونانی‌دا بوون. بەڵام پاش بیستراندنی دەنگ و چیرۆکی "ئیشتار"، خاتووخودای "ئەکێدی"، گۆڕانکاری‌یەک لە توێژینەوەکانی سەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا بـەدی‌هـات. بـۆ یەکـەم جـار ئـەو دەنگـە لـە کـەلێن‌وکولێنی ئـەو بـەردەنووس و سـوالەتانەدا دەبیسـترێ، کـە نزیکـەی پێـنج هـەزار سـاڵ لەمەوبەر، لە لایەن خەڵکی "ئەکێد"ەوە نووسرابۆوە.

سـەرەڕای ئـەوە هێشـتا تـا دۆزینـەوە و خوێندنـەوەی دەقی شـیعرەکانی "ئینهێدۆنا" چەند دەیەی مابوو. هەر وەک باسیشمان کرد لە دەیـەی هەشـتادا

بوو کە ئیتر دەنگی"ئینانا" بیسترا و چیرۆکەکەی لە نێوان ئەو شێعرانەدا گێڕدراوە. هەوەڵ ئاسەوارێک کە لە بابەت ئەوەوە چاپ کرا ناوی: "ئینانا، خاتوونی بەهەشت و زەوین" بوو. ئەو کۆمەڵە دەقە گردوکۆیەک بوو لە نووسراوەی سومێرناسانێکی وەک"سامۆئیل کریمێر" و "دیان فۆلکشتاین". لەو کتێبەدا "کریمێر" زیاتر لە سەر کۆنترین ئاسەوار و وەرگێڕدراوەکان دواوە، لە کاتێکدا "فۆلکشتاین" هەولی داوە لە ئاوێنەی ژنی ئەمڕۆدا، وێنەیەکی شاعیرانە لە "ئینانا" بە دەستەوە بدا. ژنێک کە هەوڵ دەدا شوێن و جێگەی خۆی لە بازاڕی کاردا دابین بکات. هاوکات لەگەڵ ئەوەش بە مەبەستی نیشاندانی توانای تاکەکەسی و پتەوی کەسایەتی خۆی، سووچە شاراوەکانی هەستی ئەویندارانە و سێکسی خۆی دەنوێنێ و ئازایانە دەریدەبڕێ. بە یارمەتی هەولێکی لەو چەشنەیە کە نووسەر لە نێوان ژنی هاوچەرخ و وێنە کەونارایییەکەی پردێک هەڵدەبەستێ. "ئینانا" وێنەی کەونارایی ژنی ئەورۆ، "یوونی"یەکەی خۆی وەک نیشانی بەروبوو و راست هەر وەک هەوڵ و تێکۆشانی ئەو لە چاندن و کێڵان و بەرهەمهێنانی حاسلاتدا ستایش دەکا، هاوکات بنەما سەرەکییەکانی فەرهەنگی خۆی دادەمەزرێنێ. هەر ئەویشە "پاپۆڕی بەهەشت" بەرەو شوێنی ئامانج و مەبەست دەئاژوێ. هەر بەو جۆرەی کە ژنی ئەورۆ بە گەڕانەوە بۆ بازاڕی کار، توانای بەرهەمهێنانی خۆی، کە پێشتر تەنیا لە پاوانی پیاوان دابوو، لەگەڵ توانای ئافراندنی مرۆڤ، کە ئێستاش هەر لە پاوانی ژن دایە، تێکەڵ دەکا. دوو هەزار ساڵ پاش "ئینانا"یە کە تێدەگەین، دوای پاوانکرانی توانای

بەرهەمهێنان لە لایەن پیاوانەوە، ئوستوورەکانی ژنسالاری بە تایبەت لە ئەدەبی یوونانیدا، جێگەی خۆیان دەدەنە چیرۆکی پیاوانە. پاشان دوا بە دوای ئەوەش دەبینین "حەووا" بە یەکەمین گوناح تاوانبار دەکرێ و مەجبوور دەبێ گەڵا بپۆشێ و لە ژێر سێبەری گێڕانەوەی پیاوانەدا بنێژرێ.

ئوستوورەی "ئینانا" هاوسانە لەگەڵ ئوستوورەی "ئیشتار"، کە وەک هاوتای ئەکیدی "ئینانا" دەناسرێ. ئەگەرچی لێرە و لە شێعری "ئینهیدۆنا"دا، چیرۆکەکە زۆر شاراوەیە و بە زمانێکی خوازەیی داپۆشراوە و بێجگە لە ماکە چیرۆکی و شایەدە جوغرافیاییەکان، شوێن پێیەکی دیار لەو هاوسانییە نابیندرێ، لە راستیدا دەبێ ئوستوورەی "ئینانا" لە شوێنێکی تر و وێڕای هێندێک قەرز وەرگرتن لە ئوستوورەی "ئیشتار" کامڵ بکرێ. سەرەڕای ئەوەش، بەر لەوەی چیرۆکی "ئیشتار" بۆ خستنە ڕووی هێڵە گشتییەکانی شێعرەکە بگێڕینەوە، واباشە ئاماژەیەکی کورت بە ئوستوورەی نجوومی ئەستێرەکەی "ئیشتار" و هەروەها ماکە جوغرافیاییەکانی شێعرەکە بکەین.

"ئینانا" خاتووخودای سومێری و لەویش کۆنتر "ئیشتار" لە ژیاری ئەکیدیدا، خودای ئاگاداریی خەڵک، ئەوین، بەروبوو، و هەروەها خودای شەڕ بوو. نیشانەی ئەو ئەستێرەی پێنج پەڕە. خاڵی سەرەکی، واتە بابەتی گرینگی ئوستوورەی ئەم خاتووخودایە ئەستێرەی ناهید بووە، کە لە زانستی نجوومی وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا، شوێندانانێکی قووڵی بووە، هەر وەک کاریگەری لە سەر هاوتا ئێرانییەکەی، "ئاناهیتا"(ناهید) یان "ئافرۆدیت"ی

یوونانی، یان "ئیشتار"ی سومێری و هەروەها "زوهرە"ی سامی داناوە. ئەو ئەستێرەیە کە پڕشەنگدارە و بە چاوی ئاساییش دەبیندرێ، تایبەتمەندی خۆی هەیە. هەر بەو هۆیەش یەکێک لە گرینگترین، قووڵترین و شوێندانەرترین ئوستوورە نجوومی‌یەکانی لێ بەدی‌هاتووە. ئەستێرەی "ناهید"(٣)لە گۆشەی ٤٨ دەرەجەی خۆر، هەمیشە یان بەر لە خۆرهەڵات یان پاش خۆرنشین لە ئاسماندا بەدی دەکرێ. ئەم ئەستێرەیە بۆ ماوەی ٢٤٧ رۆژ لە رۆژئاوا و پاش خۆرنشین وەدەر دەکەوێ، کە لە فارسی‌دا "شباهنگ"ی پێ دەڵێن و لەو کاتەدا نیشانەی ئەوین و ئەوینداری‌یە، لەوە رایە کە"فیردەوسی" لە چیرۆکی "رۆستەم" و "سوهراب"دا، دیمەنی چوونی "تەهمینە" بۆ هۆدەکەی "تەهەمتەن" واتە رۆستەم بە وەسفی ئەو ئەستێرەیە لە ئاسماندا دەست پێ‌دەکا:

چو یک بهره از تیره شب درگذشت

شباهنگ بر چرخ گردان بگشت(٤)

واتە چون شەو داهات کاتی ئەوینداریش گەیشت. بەڵام ئەو ئەستێرەیە پاش چاردە رۆژ ون بوون، دیسان و ئەوجار لە رۆژهەڵات و بەر لە هەڵاتنی خۆر بەدی دەکرێ، هەڵبەت بۆ ماوەی ٢٤٥ رۆژ ئەو رەوتە درێژەی دەبێ. لەو حاڵەتەدا ئەو ئەستێرەیە نیشانەی شەڕ و خەباتگێڕی‌یە. نیزامی گەنجەوی "شباهنگ"ی بەو مانایەش هێناوە. ئەو بۆ نیشاندانی بڕیار و ئامانجی ئەسکەندەر بۆ رۆیشتن و گرتنی وڵاتە جۆراوجۆرەکان ئاوا دەڵێ"

دگر بار دولت درآمد به کار

دل دوستی با سخن گشت یار

فرورفت شب روز روشن رسید

شباهنگ را صبح صادق دمید

دگر باره بختم سبک خیز شد

نشاط دلم بر سخن تیز شد(٥)

بە رای ئەستێرەناسێکی وەکوو "ئەبووڕیحانی بیروونی"، ئەستێرەی زوهرە و لە راستیدا خاتووخودا "ئینانا"، نوێنەری وڵاتی "نێوانچۆمان" و "حیجازە"(٦)و هەر لەوەش رایە کە ئەو ئەستێرە پێنجپەڕە، لەسەر زۆربەی ئاڵا ئیسلامییەکان دەبیندرێ. مەبەستی ئەوان لە نواندنی ئەو ئەستێرەیە، ئەستێرەی بەیانییە و بە واتای شەڕ و جەهادی بەکار دێنن. بۆوەی ئەو واتایە لەسەر ئاڵاکەیان نیشان بدرێ، زۆربەی جاران ئەو ئەستێرەیە لە دڵی هیلالی سەرەتای مانگدا دەکێشنەوە، بەو مانایە کە ئەستێرەکە لە رۆژهەڵاتەوە هەڵدێ، کەوابوو ئەستێرەی بەربەیانە. ئەستێرەی پێنجپەڕ نیشانەی ئەرتەشی ئورووپاییش بووە لە هەمبەر ئیمپڕاتووری عوسمانی، بەر لەویش نیشانەی موسوڵمانەکان بووە. لە راستیدا ئورووپاییەکان ئەو ئەستێرەیە کە لە سەر ئاڵای عوسمانییەکان بوو، لە سەر ئاڵای خۆیان دەکێشنەوە تاکوو بەم شێوەیە خودای شەڕی هێزی دژ و دوژمنی خۆیان داگیر بکەن. ئەوەش راست ئەو گۆڕانە بوو "رۆمی"یەکان پتر لە دووهەزار ساڵ لەمەوبەر بەسەر "میترا"، خودای شەڕی ئێرانیان هێنا، تا وای لێهات "میترا" بوو بە یەکێک لە مەزنترین خودایانی "رۆمی" و پەرەستگەیەکی

زۆریـان بـۆ سـاز کـرد، بەتایبــەت لــە ناوچــە سـنووری‌یەکانی لای خـاکی دوژمنەوە. ئەستێرەی پێنجپەڕ لە"ئامریکا"ش هەر بەو مانایە بـەکار دەهێندرێ و لە سەر هـەموو کەرەسـە و ئامرازەکانی شـەڕ دەبیندرێ. تەنانـەت لـەوەش گرینگ‌تر لەسەر شـانی ئەفسـەر و ژنراڵەکانیشیان وەبەر چاو دێ. پێنتاگۆن کە بە واتای ئەستێرەی پێنجپەڕە. وێنەیەکی تری ئەم ئەستێرەیەیە، هـەر ئـەو مانایەشــــی هەیــــە و وەک بنکــــە و پێگــــەی خــــودای شــــەڕ ناســــراوە. کۆمۆنیستەکانیش ئەو ئەستێرەیان وەک نیشانە و هێمای خەبات دژ بە چینی بۆرژوا و سەرمایەداری بەکار هێنا. ئەوەش هەر ئەو ئەستێرەیە کە لە سـەر ئالای "یەکیەتی سۆڤیەتی" پێشوو و "چین" و "کوریای باکوور" دەبیندرێ.

بەڵام [با باسێکی] باری جوغراڤیایی بابەتەکە [بکەین]، هـەر وەک دواتر لە شێعرەکەدا دەبینین شاخ و خودای شاخ "ئینۆنـا" یـان رەنگە "ئیبـە" رۆڵێکی گرینــگ و ســەرەکی‌یان هەیــە. هــەروەها بــارودۆخی شــوێن و فــەزای شـێعرەکەش بـە جۆرێـک ئاماژەیەکـە بـۆ دیمـەنێکی کوێسـتانی، هـەر لەبـەر هـەبوونی ئـەو ماکانەشـە کـە زۆربـەی تـوێژەران پێیـان وایـە ئووسـتوورەی "ئینانا" لـە وڵاتێکی کوێسـتانی یـان لانی‌کـەم نزیـک بـە وڵاتێکی کوێسـتانی و وێش‌دەچێ لە ناوچەکانی رۆژئاوای زنجیرە کێوی زاگرۆس هـەوێنی گرتبێ. چونکـە لـە دەشـتەکانی "نێوانچۆمـان" و تەنانـەت لـە وڵاتـی "میسـر"یش کـە ئەوێش بۆی هەیە بێشکەی شارستانییەت بووبێت، شاخ و کێوێکی بـەرچاوی لـێ نـەبووە و ئێسـتاش لێـی نییـە. خـاڵێکی سـەرنجڕاکێشـی تـر، ئـاڵوگۆڕی وەرزەکانـە کـە لـە"نێوانچۆمان" کـەمتر بـەرچاوە. لـەوەش را کـە سـەرما و

گەرما، وەک کەرەسە و ئامرازی شەڕی "ئینانا" ناو دەبردرێن، بۆی هەیە ئاماژەیەک بێ بۆ وڵاتێک بە کەشوهەوایەکی مامناوەندی‌یەوە. بە سەرنجدان بەو خاڵانە واباشە هێڵە سەرەکی‌یەکانی چیرۆکی "ئیشتار"، هاوتای ئەکێدی "ئینانا" لێرەدا بهێنینەوە.

لە ئوستوورەی "ئیشتار"دا هاتووە کە ئەو پاش ئەوەی "تەمووز" یان "دۆمۆز"ی(٧) کوڕی دەبێ، حوکماتی سەر زەمین بەو دەبەخشێ. بەڵام کاتێک تێدەگا لە لایەن خەڵکەوە پێشوازی‌یەکی سەیری لێ‌دەکرێ و خەڵک ئەویان [لە دایکی] خۆش‌تر دەوێ، رقی لێ هەڵدەگرێ و تاقمێک دەنێرێتە سەر زەوین و رایان دەسپێرێ، هەر چۆنێک بێ سەری بە گۆم داکەن و لە ناوی بەرن. ئەوانیش تەمووز بریندار دەکەن و بە برینداری دەینێرنە جیهانی مردووەکانەوە. پاش رۆیشتنی "تەمووز" بۆ جیهانی تاریکی، دونیای روون دەبێتە شۆرەکاتێکی وشک و بێ ئاو و سەوزەڵانی. خەڵکی لە بارەگای "ئیشتار" دەست دەکەن بە پاڕانەوە و لاڵانەوە و ئەو لە کردەی خۆی پەژیوان دەبێتەوە، دەچێتە جیهانی مردووەکان بەڵکوو کوڕەکەی بگەڕێنێتەوە، بەڵام خوشکی "ئیشتار" کە دەستەڵاتداری جیهانی مردووەکانە، مل نادا و ئیشتار ناچار مەرجەکەی ئەو قەبووڵ دەکا کە تەمووز شەش مانگ لە ساڵ لە ژێر زەوین بێ و شەش مانگیش زیندوو بێتەوە و بێتەوە رووی زەوین. بەو شێوەیە وەرزە سارد و گەرمەکان لە سەر عەرز بەدی دێن. لەدایکبوونی "تەمووز" بۆ "ئیشتار" دەرد و ئێشێکی زۆری پێوەیە، بەڵام دووبارە لەدایکبوونەوەی ئەو، واتە گەڕانەوەی عەولادەکەی "ئیشتار" لە

جیهانی مردووەکان، بەژانتر و هاورێ لە گەڵ ئێش و برکێکی دەروونی‌یە. لەدایکبوونی هەوەڵ ئاوێتەی خۆشەویستی و چێژە، بەڵام لەدایکبوونی دووهەم، هاورێ لە گەڵ پەژیوانی و لە خۆ بوردوویی‌یە. رۆیشتنی "ئیشتار" بۆ جیهانی مردووەکان، واتە هەمبەر بوون لە گەڵ دژوارترین بارودۆخ، نیشانەی لە خۆ بوردوویی و پەژیوانی و تویژبەردانی گیان و رووحە. لەدایکبوونەوەی سەرلەنوێی "تەمووز" نیشانەی تێپەڕین لەو جیهانە ترسێنەر و بەسامەیە. ئەوە هەر بنەما بنەڕەتی‌یەکانی فەرهەنگی وەرزێڕی‌یە، کە پێشتر "ئینانا" داپرشتووە و بە مەرگ و لەدایکبوونەوەی گژ و گیا لە وەرزەکانی زستان و هاویندا، سەرلەنوێ نیشان دەدرێتەوە. ئاسەواری ئەم ئوستوورەیە لە سەر فەرهەنگی ئێرانیش ئاشکرا و حاشاهەڵنەگرە. بەڕای "مێهردادی بەهار" سیاوەش هەر هەمان کەسایەتی تەموزە لە ئەستوورە ئێرانی‌یەکاندا. (٨)لە نێوان چیرۆکی "سیاوەش" و "تەمووز"، خودای رووەکی ژیاری "نێوانچۆمان" بێ‌شک وێکچوونێکی زۆر هەیە، بەڵام ئەوە تەنیا نموونە نییە و جگە لەوە نموونەی دیکەش زۆرن. بێجگە لەوەش گەلاڵەی دایک و کوڕ بە شێوەیەکی بەرچاوتر و بەهێزتر لە باقی ئوستوورە ئێرانی‌یەکاندا ئەو کاریگەری‌یەیان پێوە دیارە. بۆ وێنە پێوەندی نێوان "هومای" و "داراب"، ئەو کوڕەی وا دەکەوێتە بەر رقی دایکی و دەردەکرێ و پاشان دەگەڕێتەوە. هەڵبەت ئەو گەڕانەوەیەش ئاوێتەی ژانێکی قورسە، کە دەبێ "هومای" تابشتی بێنێ. هەروەها شیمانە دەکرێ چیرۆکی "ناهید" و کوڕەکەی "ئیسکەندەر" لە نووسراوە فارسی‌یەکاندا، لە ناوچەی

"نێوانچۆمـان" و بـه شـوێن وەرگـرتن لـه چیرۆکـی سـەرەکی "ئیشـتار" و "تەمووز" دیسان گێڕدرابێتەوە. لەو چیرۆکانەدا ماکی هاوسانی تر زۆرن کە رەنگـه ئـەو شـوێنداناں و شـوێن وەرگرتنانـه بـەهێزتر بکـەن. لـه لایـەکی تریشـەوە شـوێنی ئـەو چیرۆکـه لـه ئوسـتووره یوونانیـیەکانیشدا دەبینرێ. خـودای رووەک "ئـەدونیس" و گەڕانـەوەی ئـەو لـه جیهـانی مردووەکـان لـه سـەردەمێکی تـردا لـه پێوەنـدی نێـوان "عیسـا" و "مەریـەم"دا شـکڵ و شـێوەی تازەتر به خۆوە دەگرێ و تێکەڵ ئـەوینێکی دایکانـه دەبـێ. هـەروەها دەتوانین ئاماژە بـه شـوێندانـانی ئـەو بەسـەرهاتە لەسـەر بەسـەرهاتی "ئیلعـازر"(٩)لـه شـوێنەوارە مەسـیحییەکاندا بکـەین. لـه چاخـەکانی ناوەڕاسـتی ئـەورووپاش شـوێنی لەسـەر ئوسـتوورەی "فیشـرکینگ" و "شـاه ئـاتوور"(١٠)و بـاقی ئوستووره ئانگلۆساکسۆنییەکان داناوە.

تێڕوانینـی سـەر لـەنوێی ئـەم ئاسـەوارانه لـه ژێـر تیشـکی شـێعری "ئینهیدۆنـا"دا چوارچێـوە و پێـوەرە ئەدەبییـەکان تووشـی ئـاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی دەکا. به وتەی "فۆڵکشتاین" روانین له شێعری "ئینهیدۆنا" و "سافۆ"، له گۆشەنیگای ئەندێشه فیمینیستییەکانی هاوچەرخ ڕا، دەڵێی "گەڕانەوەیه بۆ داهاتوو". بێشک ئەگەر کار و توێژینـەوە لـه سـەر فەرهـەنگی "نێوانچۆمان" قووڵتر بێتـەوە، گەڕانـەوە بۆ داهـاتوو بـەرینتر و بـەرچاوتر دەبـێ، لـه ژێر سـێبەری ئـەو توێژینەوانـەدا، رەنگـه زۆربـەی بنـەما و واتـا ئەدەبییـەکان بگـۆڕدرێن، بـه تایبـەت بـه لەبەردەسـت دابـوونی ئووسـتوورەی "ئینانـا" و شێعری بـەرزی "ئینانا خـاتوونی گـەورەترین دڵ" کـه قووڵاییـیەکی فەلسـەفی

نوێ دەخاتە ڕوو. [وێدەچێ ئەو گۆڕانە ڕەوتێکی بەلەزتر بەخۆوە بگرێ] بەوتەی "بێتی میدور" وەرگێڕی ئینگلیسی شێعرەکە، توێژەرانی ئینجیل لە داهاتوودا تێدەگەن کە گریانی "ئینهێدۆنا" بەو تەرجیعبەندەوە": خۆ من هی تۆم/بۆ بە کەنیزم دەخوازی؟" هاوسانە لەگەڵ گریانەکانی "ئەییووب" کە دوو هەزار ساڵ دوای "ئینهێدۆنا" بە سەر لاپەڕەکانی کتێبی "عەهدی عەتیق"دا فرمێسکی هەڵوەراند. ئەو هەروەها دەڵێ: شوێندانانی "ئینهێدۆنا" لە سەر دەقە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکان تا ئەو رادەیەیە کە دەبێ بڵێین "ئەو هەر لە سەرەتاوە لە گەڵمان بووە". لە ڕاستیدا کاریگەری "ئینهێدۆنا" تەنیا کاریگەری شاعیرێک لە سەر شاعیرانی پاش خۆی نییە، بەڵکوو لەوەش زیاتر نیشانەی ڕۆڵ و بەشی بێ ئەملا و ئەولای ژنانە لە ئەدەبیات و فەرهەنگی جیهاندا.

"ئینهێدۆنا" شێعرەکەی لە سێ بەشدا هۆندۆتەوە. وەرگێڕاوی بەشی هەوەڵی لە ژێر ناوی ئینانا و ئیبەدا لە ژێرەوە هاتووە، بەو هیوایەی بەشەکانی تریشی لە داهاتوودا بکەوێتە بەر دەستی خوێنەران.

# ئینانا و ئیبه

ئین-نین-می-ئووش-ئا (١١)

*گازه

خاتوونی وڵاته ئاگرینەکان

داپۆشراو بە زرێی ترس

سوار چاکی جوانووی ئاگری سوور و بەتین

ئینانا

رمبی رەسەنی بە دەستەوە و

بە عەبایەکی بەسامەوە

وەک سێڵاوێکی بە گرفە و هاوار و تووڕە

هەر ئەویشە لە ناوەندی گۆڕەپاندا رادەسیَ و

مەتاڵێکی پتەو بە رووی زەویدا دەکێشیَ

خاتوونی مەزن ئینانا!

هەڵاییسێنەری شەڕ

بکووژی دوژمن

ئەو کەسەی
بارانی تیری بەسەر دوژمندا دەبارێنێ
هێز و توانا
لە هەمبەر نەیارەکاندا پێکدەهێنێ
شێری گورپیوی باخی بەهەشتە و
لەشەکان تێکدەهاڕێ و
رەگ و ریشە لە بن دێنێ
بە سەر سینگی عەرزدا

گایەکی یاخی
کە سمەکانی چاندووە لە زەویندا و
تەیاری هەڵمەتە بۆ سەر دوژمنان
شێرێکی ئاورین
نەوڕەس و بەلەسە
کە لەسەر بڕوای خۆی سوورە.

* ستایش بۆ ئەو
خاتوونی من
منداڵی زێڕێن ... پەروەردەی بەهەشت

ئینانا

کیژۆڵەی زێڕین ... پێگەیشتووی سەر گۆی زەوین

تۆ پێدەگەی

بە دوو باسکی ئاوەڵاوە

لە دوو لاوە هەر وەک ددانەکانی پادشای خۆر

ئەوکاتەی کە زریێ ترس دەپۆشی لە بەهەشت

دەبیە بلوورێکی پڕشەنگدار لە سەر رووی زەوی

ئەو کاتەی لێزگەی شاخەکان شی دەکەیەوە

دەبییە تۆڕێکی چندراو لە هەودای شین و ئاسمانی(١٢)

ئەو کاتەی کە لە ئاو دەدەی

لە رووناکی جۆباری ناو کێوەکاندا

لە دایک دەبی لە کۆساردا

لە تەلاری بلوورینی رەسەن و بێخەوشدا

ئەو کاتە لە ئامێز دەگری

عەبا لە مێژینەکان

لە مێژینە خوداکان

ئەو کاتەی سەرەکان دەبڕی

وەکوو داسێک

کە بەژنی بەرزی گەنمەکان دەدروێتەوە

پاشان سەر رەش(١٣)

ستایشت دەکا بە هۆنراوەکەیەوە

سومێرییەکان وێکڕا دەنگ هەڵدەبڕن

هەرکەس لە گەڵ هاژەی رووبارێک دەبێتە هاودەنگ

خاتوونی خەبات

یەکەم منالّی خودای مانگ(١٤)

کیژۆڵە ئینانا

ستایشت دەکەم

ئەوەیە ساز و سترانی ئەمن

*ئینانا دەنگ هەڵدەبڕێ

من، خاتوون

گەڕۆکی ئاسمانەکان

ڕێبواری بێوچانی سەر زەوین

لە رۆژهەڵات لە وڵاتەکانی ئێلەم(١٥) دەچەمێمەوە

له ڕۆژئاوا – لەولاوەتر

بە دەوری وڵاتەکانی سوبیردا دەسووڕێمەوە و

لەو لاتریش وڵاتەکانی لولوبۆ دەپێوم

هەڵمەت دەکەمە سەر کوێستان

هەر ڕاست لە ناخی دڵیەوە

من، خاتوون

نزیک بوومەوە و

کۆسار نەترسا

من ئینانا

نزیک بوومەوە

کۆسار نەترسا

هاتمە نزیک شاخی ئیبە

شاخ ڕانەچەنی و

چەقوچۆ نەیگرت

بە دەنگی لەرزینی خۆی دانەڕما و

لمبۆزی بە عەرز تێکنەشکا و

لێوەکانیشی زەوینیان ڕانەمووسی

ئەو تازە پێگەیشتوانە(١٦) دەخەمە ژێر چنگی خۆم
گیانیان دەخەمە لەرزین و
وایان لێدەکەم سامی من بیانگرێ

گایەکی بەگوڕ
بە هەموو هێز و توانایەوە تێکدەشکێنم
گوێلپارێکیش
بەو تۆزە توانایەی لە لەشی دایە

بە قامچی سەما پاشقولیان دەدەم(١٧) و
بە کەمەندی سەربزێوم وەخۆیان دێنمەوە
ئاوری شەڕ هەڵدایسێنم
تیردان و تیرم ئامادەن
لکەکانی قۆچەقانی تێک دەهاڵێنم و
نێزەی چێوی و
مەتاڵ و سەرنێزەم زاخاو دەدەم

لە سنووری دارستانەکانیان ئاور دادەگیرسێنم
بە تەور ملی درۆزنان دادەپاچم
بانگ دەهێڵمە خودای ئاور

گیبیلی بێخەوش
هەتا گڕ بەرداتە لەش و شاخە زەبەللاحەکانیان

لە ئاراتا(١٨) شاری خۆمەوە
گەوهەری شاراوەی درەوشاوە
ترس دەخەمە گیانی گشت کۆسارەکان

وەک کاتی نەفرەت لێکراوی ئان(١٩)
ئیتر قەت ناڕوێنەوە و
لە چەشنی شوێنی وێرانی ئەنلیل(٢٠)
ئیتر قەت پشت راست نەکەنەوە

رێگای من ستایش بکەن کۆسارەکان
هەر راست من ستایش بکەن
بە سترانێک

*ئینانا دەچێتە لای ئان
ئینانا
رۆڵەی خودای مانگ
گوڵێکی جوانی پێگەیشتوو

بە عەبای ژنانەیەوە

کە کەوتۆتە سەر بەلەکی ناسکی

وە سەر تەوێڵی هێوری کشاوە

تیشکێک لە بڵێسەی گڕ و ترووسکەیەک لە سام

یاقیقێکی رووناکی

لە رەنگی خوێن بە ملیدا هەڵواسیوە

پاشان بە دەستییەوە گرتووە

گورزێکی حەوت سەر

راوەستاوە لە هەیوانی لاوەتیدا و

گورزێکی بەردەوام بە دەستی راستەوە

پێ دەنێتە سەر ماڵی زین،

بەڵی پێی بچووکی

دەنێتە سەر پشتی بە تووک داپۆشراوی

گا کێوێکی ئاسمانی

هەر ئەویشە دادەمرکێنێ

سکڵی پڕ ورشەی رووناکی

لە ئاسمانی کووڕی ئێوارەدا

ئەستێرەی هەنگاوەکانی بە سەر ڕێگادا
رادەبرێ بە دەرِوازەی سەرگەردانیدا

دەچێتە دەرگای خوداوەند
تا میوە نۆبەرەکانی
بە دوعا و نزا پێشکەش ئەو بکات
ئان دەستەکانی گرتۆتەوە
میوەکان وەردەگرێ
بە خۆشی لە ئینانا دەگا و
لە کاتدا دەحەجمێ
کاتێک کە هی ئەوە و
بە جووڵەیەک ئینانا
لە لای دەستە راستی دادەنیشێنێ

ئینانا وەقسە دێ:
ئان
باوکی من. (٢١)
راوەستاو بی! سیلیم(٢٢)
قسەکانی من ببیستە
گوێ بۆ وتەی من رادێرە

ئان، وتەی تۆ

لە بەهەشتدا دەنگی داوەتەوە و

بە تروووسکەی سامی من رازاوەتەوە

ئان تۆ ئەو کەسەی

لە بەهەشت و لە سەر عەرز

زیتر لە هەر کەسێکی دی

قورسایی دەبەخشییە وتەم

ئەوە تۆی کە

ولاتێکی پان و بەرین

هەتاکوو سنووری بەهەشت(٢٣)

دەبەخشییە تەورە ئاسنین و ساردەکەم

کەسێک کە کۆلکە زێڕینەکانی هەڵداوە

جوان، وەک خاتوونە بەشکۆکان

کاتی راوەستانم پێ دەنوێنێ

ئەو شوێنەی وا تەختەکەی من داندراوە

ئەو شوێنەی وا

وەکازەکەمی لە دەستە تامەزرۆکەمدا چەماندۆتەوە

من شان لە شانی مەترسی دەدەم

لە گەڵ شەش هاوسەنگەری بە زرێی شەڕ داپۆشراو

ڕێی ئاسمان دەگرمە بەر

تا سنوورەکانی بەهەشت

وەک خاتوونێک دەچمە پێشێ و

فێنکایی مانگ لە مەمکۆڵەی ئاسمانەوە دەبارێنم

تیرەکانم لە دەستی من دەرباز دەبن و

زەوین و دارستان و باغ

وەکوو ددانی ئەقاقیا تێک دەشکێنن

تیرەکان وەکوو شەنەی تیژ

زەوی سەربزێو ڕێک دەکەن

دەستەکانم لە چەشنی چنگی بایەقووش

کەللەکان لێک بڵاو دەکەن

وەک یەکەم مار(٢٤)

لە کۆساران دەردەکەوم

بەلەز هەر وەک ئەو مارانەی لە دێراوەکاندا دەخزن

من کەللەکان تێکدەشکێنم

ئان: میری مەزن
ناوی ئەتۆ هاوڕێی منە
گولۆڵەی کەتانێکم کردۆتەوە و رایەڵم کردووە
هەتاکوو کۆتایی زەوین

چاوم شوێن بە شوێن زەوی دەدۆزێ
من دەزانم درێژایی زوەین چەندە
تێپەڕیوم بە رێی بێخەوشی بەهەشتدا
قووڵایی زەویش دەزانم
تەنانەت تۆ ئینۆنای چلەکێش(٢٥)
کە لە سامی مندا شەکاوەی
گوێم بدەیە
من خاتوونی مەزن
نزیک بوومەوە و شاخەکان رانەچەنین

من ئینانا
نزیک بوومەوە
کۆسار نەترسا
هاتمە نزیک شاخی ئیبە
شاخ رانەچەنی و

چەقوچۆ نەیگرت

بە دەنگی لەرزینی خۆی دانەڕما و

لمبۆزی بە عەرز تێکنەشکا و

لێوەکانیشی زەوینیان رانەمووسی

ئەو تازە پێگەیشتوانە دەخەمە ژێر چنگی خۆم

گیانیان دەخەمە لەرزین و

وایان لێدەکەم سامی من بیانگرێ

گایەکی بەگوڕ

بە هەموو هێز و توانایەوە تێکدەشکێنم

گوێلپارێکیش

بەو تۆزە توانایەی لە لەشی دایە

بە قامچی سەما پاشقولیان دەدەم و

بە کەمەندی سەربزێوم وەخۆیان دێنمەوە

ئاوری شەڕ هەڵدایيسێنم

تیردان و تیرم ئامادەن

لکەکانی قۆچەقانی تێکدەهاڵێنم و

نێزەی چێوی و

مەتاڵ و سەرنێزەم زاخاو دەدەم

لە سنووری دارستانەکانیان ئاور دادەگیرسێنم
بە تەور ملی درۆزنان دادەپاچم
بانگ دەهێڵمە خودای ئاور
گیبێلی بێخەوش
هەتا گڕ بەرداتە لەش و شاخە زەبەللاحەکانیان

لە ئاراتا شاری خۆمەوە
گەوهەری شاراوەی درەوشاوە
ترس دەخەمە گیانی گشت کۆسارەکان

وەک کاتی نەفرەت لێکراوی ئان
ئیتر قەت ناڕوێنەوە و
لە چەشنی شوێنی وێرانی ئەنلیل
ئیتر قەت پشت راست نەکەنەوە

رێگای من ستایش بکەن کۆسارەکان
هەر راست من ستایش بکەن
بە سترانێک

ئان

پادشای هەموو خوداکان

وڵامی دەداتەوە

ئازیزەکەم!

رۆڵەی شیرین!

تۆ کۆسارت دەوێ

ناخی دڵی

ئاوات وڵام دەداتەوە

هۆ خاتوونی مەزن

شاخی ئیبە

تۆ خۆت ویستت

تۆ خۆت حەستەمترینیانت هەڵبژارد

ئە ئاوای بە ئینانا وت:

خوداکان

لە شوێنی خۆیان راوەستاون

لە ترسان سوژدەیان بۆ ئیبە برد

ئینۆنا

لە تافی پیرۆزی خۆیدا دانیشتوو

خەمین و لەرزۆک
بە لەشێکی نەشتەرئاژن کراوەوە

سامێکی سووری ئاگرین
هەموو نیشتمانی ئێمە گۆج دەکا
سامێکی ئاگرین لە کۆسارەکانی ئێبە را
قین دەخولقێنێ لە وڵاتەکانی چوار دەورمان

ترۆپکی شاخی ئێبە
گومبەزی قووڵی شینی بەرەو قەراغێک رادا
دارەکان
بە بەروبوویەکی زۆرەوە، گەیشتوو
لە دامێنیدا سەربەرزانە وەستاون

توێژ توێژ گەڵای ئەستوور
بە دارە چڕ و پڕەکانییەوە
ئاسمان تاریک دادەگیرێن

شێرەکان جووت جووت
دێن و دەچن لە ژێر نسێی ئەو لقانەی

پەنجە لە ئاسمان دەسوون

بەرانە کێوی بە خوری نەرم و نۆڵەوە

بزنە کێوی چاو کراوە

بێ شوان لێر و لەوێ، بەڕەڵڵای سەر تەپۆڵکەکان

گا کێوی لە هات و چۆدا

پێیان ناوەتە سەر پەڕەمووچی کەرویێشکەی سەوزەڵانی

بزنێک بە جووتێک شاخی چەماوە

لە ژێر دارە سەروە کۆساری‌یەکان

لە جووتەکەی خۆی دەگەڕێ

من یەکەم زەبری سامم

بەسەر شکۆی بێ‌کۆتایاندا

من، وێڕای تۆ ناچمە ئەوێ

هۆ کیژۆڵە ئینانا

من سەر لە پێناوی تۆ نانێم

لە هەمبەر ترووسکەی ئاگرینی کۆسار

ئان ئاوا لە گەڵی دەدوێ

ئینانا! پێشوێژ

سۆفیلکەی پێشوێژی بەدشووم!

دڵی دەکەوێتە چنگی قینەوە

بە زەبری پاژنەکانی

ئینانا لە پڕێکدا

دەڕوازەی ماڵی شەڕ دەخاتە سەر پشت

بە دەستەکانی ئاڵقەڕێز

لە دەرگای شینی دەردێنێ

بە هەڵڵا و بگرەوە- شێتییەکی دەرباز بوو لە ماڵی کەوان

شەڕی شێتانەی خۆی دادەبارێنێ

لە نێوان باسکەکانیدا باهۆز هەڵدەسووڕێنێ

ئەوسا بۆ عەردی دەنێرێ

ئافرەت ژێی ناسک دەکێشێ

تیرە بێهەڵەکان- تەیاری هاوێژران

باهۆزەکانیش

زەوی تێکەوە دەپێچن. لوول دەخۆن، نەشتەر دەبارێنن و

هەڵدەفڕن لە گەڵ ئینانا

عەردی پان و بەرین

لە کەش‌وهەوای خۆش‌دا هەڵدەمژنە ناخیانەوە

تەپ‌وتۆز ڕێگە بە پیلوو و هەناسە دەگرێ و

وێڕای وردە بەردی شکاو و وردە خیزی سوور بۆوە

لە گەڵ خۆڵەمێش دەسووڕێتەوە و رادەبرێ

خاتوونی مەزنی من کێوەکە تێکدەشکێنێ

پانێی بە تەختی عەرزیدا دەکوتێ و

دەمی خەنجەر لە هەسانی بەردەکان دەسوێ

ئەستۆی ئیبەی توند گرتووە

هەر وەک باقەیەک حەیزەران

هەوا تیژ تێپەڕ

بە ناسکە گریانێکی ورد

درز دەخاتە دڵی بێ‌هێزی ئیبەوە

بە بەردی دامێنی شاخ

ئینانا تێکدەهاڕێ، مست دەهاوێ

پێک دادەدا و لێک هەڵدەبڕێ

تۆفانی رەوەزەکان

خاڵیگەی شاخ لێک هەڵدەدڕێ

مارەکان خەمۆک و تێکهاڵاو
بە لقەکانەوە هەڵواسراو
لە سەر ئەمری بەسامی ئینانا درۆشە دەردێنن
ژاری کوشەندەی خۆیان دادەبارێنن
زمانی ژاراوی ئیناناش
وەک گیایەکی سیسکەری نەفرەتلێکراو
بە دەوران دەوری دارە پڕ بەرەکان و
دارستانە سەوزەکاندا لوول دەخوا

ئینانا بێبەزەیی
هەناسەی داغ و ویشکی خۆی دەبزوێنێ
بە سەر هەڵاڵەی رووەک و گیای شلکدا
تۆز و خۆڵی وشکیش زۆر بێ بەزەییانە
وەک گژەبایەک بە سەر لاسکی قەوزە گرتوودا دەبارێنێ
تا بەڵکوو دوامین دڵۆپەی شەونەمیش لە بن بێنێ

بە سەر مێرگە سیس هەڵگەڕاوەکاندا
هەر تۆفانی ئاگرە دەبارێ
بڵێسە ئاسمان بە بەژنی رەوەز دەبڕێ
سەمای قامەتی بڵێسە دووکەڵ بە وڵات وەردەکا

trووسکەی خاتوونی مەزن لە ساتێکدا هەموو وڵات دادەگرێ

ئینانای پیرۆز

نوێ روخساری نەترس

بەهێز وێنەی سەرکردەیەکی چوارشانە و لاو

لە شەڕێکدا کۆسار بە چۆک دادەهێنێ و

سەرکەوتوو لە جێگای خۆیدا رادەوەستێ

کۆسار! ئینانا دەگری

ئیبە!

چونکە تۆ باڵات کرد و قەدت کێشا

چونکە تۆ ئاوەها بەرز راوەستای

بە کەپەنکێکی ئاوا جوانەوە

خوێن شیرین و سەوز و لەخۆبایی

عەبای میریی بە شانەوە و

ئامێزت کراوە بە رووی ئاندا

لمبۆز لە عەرزی مەخشێنە و

لێوت لە عەرزی مەسوو

من ئەتۆم کوشت

من بە پەژارەوە هەڵمەتم کردە دڵت

تۆ ئەی فیلی بە تاقەت

لووتی بەرزت بادەدەم
ئەی گا کێوی بە شان و باهۆ
ملت دەشکێنم

دوو شاخی ئەستوورت دەگرم
توورت دەدەمە ناو تەپوتۆزەوە
بە قینەوە پێت ڕێدەخەم
هەتا فرمێسک روخسارت بخووسێنێ و
پەژارە دڵت داگیر کا

ئینانا
سەرکەوتووی بەسام
دیسان زمانت بگەڕێ
کێو، کوێستان
باوکە ئیبە ئیزنم بدە
هەتاکوو گورزی سامناکم
بە دەستی راستی بەهێزمەوە بگرم و
بە دەستی چەپ تەورەکەشم هەڵسووڕێنم
تەور و گورز بە قەستی بڕین هەڵدەدڕن
وەکوو نووکی تیژی شەنە

ئینانا پەرەستگەی سەرکەوتنی خۆی چێ دەکا

بەرد لە سەر بەرد
پەرەستگە ساز دەکەم
تا هەرێمی حوکماتی خۆم دیاری بکەم
بەرد لە سەر بەرد
بە گەورەیی و شکۆوە تەواوی دەکەم
لە سەر تەختی گاشەبەردێک قورس و قایم رادەوەستێ و
تافی دانیشتن دەڕازێنێتەوە
"کوروگارایەک" بۆ گازە کردن بانگ بێڵە
ئامرازی پیرۆز، گورز و خەنجەری پێ ببەخشە
"گالایەک"(٢٦) بانگ کە
سەردوولکەوێژێکی سەرشین
ئامرازەکانی ستایش
تەپڵ و تەمبوورەی بدەیە
بانگ کە خزمەتکارە پیرۆزەکان
بۆ رێورەسمی وەرگەڕانی تەخت و بەخت
کاهین دەبێتە ژن و
کاهینەش دەبێتە پیاو

من ئەو پەرەستگە بە شکۆیە ساز دەکەم

ئەو کەسەی کە توانی هەڵمەت بکاتە کێوەکان

ئەو کەسەی ئێستە سەرکەوتوو راوەستاوە

ئاوهەڵدێر، لافاوێکی بە لرفە

من مێرگەکانم شۆردەوە

بە شەپۆلی توندی بەلەز

پەرژینەکانیشم بە تاڵان برد

کۆسارەکان!

من سەرکەوتووم

ئیبە!

من سەرکەوتووم

یەکەم کیژی مانگ

کە ئیبەت تەفر و توونا کرد

ئینانای کیژۆڵە

ستایش بکرێ!

(وە) ستایش(هەر شایانی) نیسابایە

کەخاتووخودای نووسینە.

پەراوێزەکان:

١- ئەو شێعرە وەرگێڕاوی ئەو کتێبەی ژێرەوە :

Inana: lady of larjest heart,poems of the Sumerian haigh priestess enhedunna,translated by betty de shong meador,university of texas press,austin1988 .

٢-یوونی لە زمانی سانسکریت دا بە ئەندامی مێوینەی ژن دەڵێن، هەروەها لە ئایینە هیندوەکاندا وشەیەکی پیرۆزە.

٣-وێکچوونی ئاناهیتا و ئینانا لە لایەن زۆربەی مێژوونووسانەوە سەلمێندراوە. بۆ وێنە هیرۆدۆت دەڵێ: ئێرانییەکان ستایشی ئورانیا (urania) لە ئاشووریی و عەرەبەکانەوە فێر بوون. برۆسووسیش کە مێژوونووسێکی کەلدانی سێ سەدە بەر لە زایینە دەنووسێ: ئەردەشیری دووهەمی هەخامەنیشی پەیکەرەی ئافرۆدیتی لە بابێل و شووش و هەمەدان و دیمەشق و سارد دامەزراند و ستایش کردنی ئەوی فێری خەڵکی رۆژئاوا و باشوور کرد. (یەشتەکان، ئیبراهیم پووررداوود، ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەساتیر، بەرگی یەکەم، لاپەڕەی١٦٤-١٦٣)

٤-شانامەی فیردەوسی، چاپی مۆسکۆ، بەرگی دووهەم، لاپەڕەی ١٧٤ و٦٢

٥-نیزامی گەنجەوی، ئیقباڵنامە، ناوەندی نیگاه، لاپەڕەی١٣٢٣

٦-ابوریحــان بیرونــی، "التفهـیم"، نشـر همـا، ١٣٦٧، ل١٩٨، آثـار الباقیـه ل٤٥٧

٧-تەمووز لە ئووستوورەی ئیناناداا مێردی ئەوە و ئینانا لە ئەنجامدا ئـەو بـە جێـی خـۆی بـۆ مـاوەی شـەش مانـگ لـە سـاڵ دەنێرێتـە جیهـانی تاریکیەوە. "دێهخودا" لە ژێر وشـەی تـەمووزدا ئاوای نووسیوە: لـە زەمـانی بـابیلیدا خوداوەنـدی بـەهار و یـار و هـاودەم یـان تەنانـەت مێـردی ئینانـا خـاتووخودای زاوزێ و بەروبوو بـوو. هـەر ئـەو ناوەشـە کـە لـە نـاوی مانگـە سوورریانیی‌یەکاندا هەیە. تەمووز ناوی هەوەڵ مانگی هـاوین و مـانگی دەهـەم لە ساڵی رۆمـی و سـوورریانیی‌یەکانە کە لـە نێوان حـوزەیران و ئـاب(ژوون و ئووت)دایە. بۆ وێنە:

که زنده است آن خرد کودک هنوز

و یا شد ز سرما و مهر تموز

٨-بڕوانـــە: مهـــرداد بهـــار، از اســـطوره تـــا تـــاریخ، وتـــاری "ســـوگ سیاوش"١٣٧٩، ل٤٥٩-٤٦٩

٩-عیسا بە هەناسەی خۆی ئەلعازێر زیندوو دەکاتەوە و بەم جۆرە ئەو لە جیهانی مردووەکان دەگەڕێنێتەوە.

١٠-ئەو دوو کەسایەتی‌یە ئوستوورەیی‌یەی چاخەکانی ناوەڕاستیش بـە مـەرگ و نەمانـەوەی خۆیـان لـە جیهـانی مردووەکـان، لـە گـەڵ کۆتـایی هـاتنی وەرزی سارد و دەسـتپێکی وەرزی گـەرما پێوەندی‌یـەکی راسـتەوخۆی هەیـە. تی ئێس ئیلیووت لە شێعری بەرز و بە ناوبانگی خۆی واتە "وڵاتی قاقڕ"دا لـە ناوی ئەو کەسایەتی‌یە کەڵکی وەرگرتووە.

١١-ئـەوە یەکـەم میسـڕاعی شـێعرەکەیە و سـەردێڕی بـە ناوبـانگی شـێعرەکە لـە لای سـوومێرییەکان ماناکـەی ئاوایـە: خـاتوونی هـەرێمی درەوشاوەکان. ئینانا و ئیبە ناوێکی نوێیە کە زۆربەی سومێرناسان بۆ ئەم شێعرەیان داناوە.

١٢-تۆڕی شین(sa-za-gin)سەزگین، پێوەندی هەیە بە تۆڕی مەزن واتە سە، شوش، گال(sa-sus-gal)ئامرازێکی شەڕە کە بە پێی بڕوای هال پێوەندی بە تووڕەیی خوداکانەوە هەیە.

١٣-سومێرییەکان بەو ناوە ناسرابوون.

١٤-ئینانا خوشکە گەورەی خودای خۆر واتە "ئۆتۆ"یە.

١٥-ئیلەم، سووبیر و لۆلۆبۆ ئەو وڵاتانە بوون کە لەژێر دەستەڵاتی سارگۆن(یەکەم ئیمپڕاتووری نێوانچۆمان)دا بوون.

١٦-وێدەچێ مەبەست لە زاراوەی تازە پێگەیشتوو شاخێک بێ کە تازە روواوە. لە دەقە کەونارایییەکاندا زۆر باسی رووانی شاخەکان کراوە.

١٧-قـەمچی پیـرۆزی ئینانـا بەشـێک لـە یـاری یـان سـەمایەکە کـە لـە جێژنەکانی ئەودا بەڕێوە چووە.

١٨-ئاراتا شارێکی بە ناوبانگی کوێستانی بووە لـە ئێرانی کـەونارادا کـە خەڵکەکـەی لـە پەرەسـتگەی سـوومێرییەکان دا عیبادەتیـان کـردووە و بنـەما ئایینییـەکانی ئینانایـان هـەبووە. ئاراتـا لەبـەر کۆیلـە و پیشەسـازییەکەی بەناوبانگ بووە.

١٩- بـە پێـی زانیـاری کتێبی(شـناخت هویـت زن ایرانـی، مهرانگیزکـار و شهلا لاهیجی)ئان خودای ئاسمانە.

٢٠- بە پێی زانیاری کتێبی(شناخت هویت زن ایرانی، مهرانگیزکار و شهلا لاهیجی)ئینلیل کوڕی ئان و ئیمپراتووری خوداکانی سەر زەویە. لە هەندێ سەرچاوەشدا بە واتای خودای هەوا هاتووە.

٢١-زاراوەیەکە بۆ ڕێزگرتن لە گەورە پیاوان.

٢٢-لە دەقەکەدا سیلیم هاتووە و وەرگێڕ بڕوای وایە کە وشەیەکی سومێرییە و بۆی هەیە هەر وشەی سەلامی عەرەبی بێت.

٢٣- ئەم کۆپلەیە وێکچوونی هەیە لەگەڵ چیرۆکی ڕۆیشتنی کاووس بۆ ئاسمان کە لە "بندهش و دینکرد"دا هاتووە.

٢٤-موش، سگ، کل(mus-sag-kal) بوونەوەرێکی ئووستوورەییە بە مانای ماری یەکەم یان یەکەم جۆری مارە

٢٥-"ئینۆ"ناکان راوێژکاری خوداکانن. لە سومێریدا ناوی ئەوان(an-nun-ke) ئان-نون-کێ، کە بە واتای ئاو یان تۆمی شازادەیە و بۆی هەیە لە وشەی(a-nun-ke)ئا-نوون-کێ یان ئینکی را هاتبێ کە خودای ئاوە شیرنەکان و خودای ئارەزوویە و ئەو کەسەیە کە بە پێی ئوستوورەیەک ئاوەکانی دیجلە و فورات لە تۆوی ئەو را سەرچاوەیان گرتووە.

٢٦-کووروگارا و گالا، دوو کاهینن کە نێرمایی یان جسنی دیاریکراویان نییە.

سەرچاوەکان:

١ـ هنرمند، سعید، کهن‌ترین شعر دنیا، اینانا بانوی بزرگ‌ترین قلب، مجله بخارا، بی‌تا

٢ـ مومنی، خورشید،(١٣٨٢) میان‌رودان، تمدن سومری و کهن‌ترین شعر گیتی، مجله چیستا

٣ـ آبادپور، آیدا (١٣٨٦) آیین زرتشت ـ نشست دهم: سرای سرود و سرای دروغ، سایت کانون پژوهش‌های ایرانشناسی (http://pajuhesh-iranshenasi.blogfa.com/post-34.aspx)

# ئەو شاعیرەی بە خراپەی خۆیدا هەڵدەکوت

## شێعر و ژیانی "سافۆ" ژنە شاعیری کەونارا



سافۆ" لە شاعیرانی یوونانی چاخی حەوتەمی بەر لە زایین بوو کە لە سەردەمی کەوناراادا بە ناوی مەزنترین شاعیری شێعری ئەویندارنە لەقەڵەم دراوە. ئەو هەوەڵ ژنێک بوو کە لە پەنا هەستی تاکەکەسی خۆیەوە، تایبەتیترین هەستەکانی ژنانەی لە شێعردا دەردەبڕی. شێعرەکانی شوێنێکی کاریگەریان لەسەر هاوچاخەکانی دانا. هەر بە زیندی سەری نە تەنیا لە شاری شوێنەزای خۆی، بەڵکوو لە شوێنە دوورەدەستەکانیش بەرهەمەکانی دەخوێندرانەوە و سەرنجی هۆگرانی شێعریان بۆ لای خۆیان رادەکێشا. بە بڕوای "ئەفلاتوون" ئەو دەیەمین خاتووخودای هونەرە. "کاتولووس" وەک "سافۆی پیاو" ناوی دێنێ و شێخێکی ئاسووری بە ناوی "تاتیانووس" وەک سۆزانیی، شێتی ئەوین و ئەو کەسەی بە خراپەی خۆیدا هەڵدەڵێ ناوی دەبا. زیاترین دەنگۆ لەمەڕ ئەودا، باسی هۆگری ئەوە بە هاوجسنخوازی، کە تاقمێک لە نووسەران ئاماژەیان پێکردووە. "سافۆ" لە شێعرەکانیدا ستایشی ئەوینی نێوان ژنان دەکا. تایبەتمەندی سەرەکی نووسراوەکانی، بوێری و دەربڕینی رووتی هەستی ژنانەیە، ئەویش چەندین سەدە بەر لە ئێستا، بە شێوەیەک کە ئەمڕۆکەش و تەنانەت لە داهاتووشدا ئەو بابەتانە نوێ و بوێرانە دەنوێنن.

وەک لە سەرچاوە مێژووییەکان دەردەکەوێ، سافۆ مامۆستای فێرکاری گەورە کچان، بۆ دەستپێکی ژیانی هاوبەشی تێکەڵ بە خێر و خۆشی بووە. هەر لەبەر ئەوەیە کە لەمەڕ ئەوەوە دەڵێن: هۆگری بە هاوجسنی خۆی واتە ژن بووە. کەچی بە شایەدی نووسراوەکانی و بە

گوتەی "سیموونە فریلینگ" سافۆ ئەو جۆرە نەبووە کە فیمینیستەکانی ئەمڕۆکە باسی دەکەن. ئەو شاعیرە، شێعرەکانی خۆی بۆ ستایش و ڕێزلێنان لە پلەوپایەی ژنان تەرخان کردووە. بۆ گەورەکردنەوەی ژن لە ڕوانگەی ئەو پیاوانەی کە خوازیاری ژنن حەولێکی زۆری داوە، هەروەها بۆ ئاگادار کردنەوەی پیاو لە گەورەیی و جوانییەکانی ژن تێکۆشاوە.

سافۆ لەدایکبووی دوورگەی "لیزبۆس"ە و هەر لەبەر ئەوەش ئەمڕۆکە بە ژنانی هاوجسنخواز دەڵێن لێزبین.

لە سەردەمی سافۆدا کە هاوچاخی"سۆلۆن"، "بوختوننەسەر" (فەرمانڕەوای نێوانچۆمان) و "جۆرمیا" بوو، "لیزبۆس" دوورگەیەکی زەنگین بوو کە پڕ بووە لە باخی زەیتوون و ڕەز و مەزرای بەراو و دارستانی چڕوپڕ. کەشوهەوای ناوچەی دەریای ناوەڕاست و زەوی و زاری بە پیت و بەرەکەتی ئەوێ، کۆمەڵگایەکی یەگجار دەوڵەمەندیشی بەرهەمهێنابوو. "لیزبووس" سەد ساڵ بەر لە چاخی زێڕینی "پریکلێس"، ناوەندی کولتووری یوونانی کەونارا و چاوگەی ڕاهێنای شاعیرانی شێعری ئەویندارانەی وەک "ئالکایووس" و سافۆ بوو.

دانوستان و بازرگانییەکی بێوچان لە شارەکانی نزیکەو بەستێن، لە ئاسیای بچووک و دوورگەکانی "ئێژە" و تەنانەت لە گەڵ "میسر"دا بەردەوام بوو، بەڵام بازرگانە دەریاییەکانی ئەو دوورگەیە، زیاتر هەر لە ماڵێ دەمانەوە و ڕێی دووریان نەدەگرتە بەر. ئابووری لیزبووس لە سەر بنەمای بازرگانی، پیشەسازی و زرێڤانی دامەزرابوو. شەڕاب، ڕۆن زەیتوون،

دانەوێڵە، کووپە و تونگەی سواڵەت و رۆح، چرای گڕسۆز و شتی لەو بابەتە گرینگترین حاسڵاتی بازرگانیی ئەو دوورگەیە بوون. "میتیلین" ناوەندی دوورگەی لیزبووس وەک گرینگترین شاری ئەو محاڵە دەهاتە ئەژمار. مێژوونووسان دەڵێن سافۆ لە ساڵی ٥٢٦ی بەر لە زایین لەو شارە لە دایک بووە. بەڵام دیتنەوەی هێندێک سککە لە شاری "ئێرسووس" بە وێنەی سافۆوە ئەو رایە لە گەڵ کێشە بەرەوڕوو دەکەنەوە. لەمەڕ ساڵی لەدایکبوونی سافۆشەوە ناکۆکییەکی زۆر هەیە. "ئاتوور ویگال" سیاسەتوان و مێژوونووسی ئامریکایی پێی وایە لە ساڵی ٢٦١ی بەر لە زایین لە دایک بووە. وێڕای ئەوەی کە زۆربەی نووسەران ئەو ڕێکەوتەیان پەسەند کردووە، گەلێک مێژوونووسی دی هەن کە لەگەڵ "ویگال" هاوڕا نین، چونکە پێیان وایە زۆر جار هەر ئەو نووسەرە، واتە "ویگال" بووەتە هۆی دەرخستنی نەریتی نالەبار و زانیاری دستکردی مێژوویی بەدەستەوە داوە. [لە لایەکی دیکەشەوە دیتنەوەی پاپیرووسێک کە ناوی سافۆی بە سەرەوەیە و مێژووی بۆ ٥٠٠ ساڵ بەر لە زایین دەگەڕێتەوە ئەو رایە هەڵدەوەشێنێتەوە. ]

بە گوێرەی نووسراوەی چەند نووسەرێک سافۆ سێ برای بە ناوەکانی "کاراکسووس"، "لاریکووس" و "ئۆریگیووس" هەبووە. بە پێی زانیاری مێژوونووسان "دووریکا" ژنە دەوڵەمەندی شەڕابفرۆش برا گەورەی سافۆ واتە "کاراکسووس"ی لە میسرییەکان کڕییەوە.

سافۆ لە شێعرەکانیدا بە هۆی هەبوونی پێوەندی لە نێوان "کاراکسووس" و "دوریکا"-کە "هێرۆدۆت" ناوی ئەوی بە "رودوپیس" تۆمار کردووە- رەخنە لە برای گەورەی دەگرێ. ئەم بابەتە لە چاخی کەوناراشدا بە زۆری باسی لە سەر کراوە. "ئیسترابۆ" نووسیویەتی کە لە چاخی هەوەڵی بەر لە زاییندا رەوایەتێک بووە کە باس لەوە دەکا: یەکێک لە هێرەمەکانی میسر "دوریکا" بینای کردووە. لە برای دووهەمی سافۆ تەنیا ئەوەندە زانیاری لە بەر دەست دایە کە شەرابی بە حکوومەتی "میتی لین" فرۆشتووە و ئەو ئەرکەش بە رای "ئاتینئۆس" تەنیا تایبەتی کوڕانی لاوی بنەماڵە دەست رۆیشتووەکان بووە. لەوە را بۆمان روون دەبێتەوە کە سافۆ لە بنەماڵەیەکی بە شان و شەوکەتی دوورگەی لیزبووس دەرکەوتووە، کە خاوەن زەوی و زار و باخاتێکی زۆر لە دەوروبەری شاری میتی لین بوون. هیچ هەواڵێکیش سەبارەت بە برای سێهەمی سافۆ لەبەر دەست دا نییە.. هێرۆدۆت دەڵێ ناوی باوکی سافۆ "ئیسکاماندرۆ نیمۆس"ە. (skamandronymo) و ناوی دایکیشی بە "کلەئیس" تۆمار کراوە.

تاقمێک پێیان وایە سافۆ لە تەمەنی مێرمنداڵیدا لە گەڵ "کیەرکۆلاس" کە بازرگانێکی خەڵکی دوورگەی "ئانۆرۆس" بوو، زەماوەند دەکات و بەرهەمی ئەو زەماوەندە کچێک بووە بە ناوی "کلێئیس".

"ئالکایووس"ی هۆنەر یەکێک لە هەڤاڵانی سافۆ بوو کە زۆر بە گەرمە ستایشی دەکا. بە رای "هێرمسیاناس"، "ئالکایووس" چەنگی لێدەدا و سترانی

دەخوێند تەنیا لە بەر ئەوەی ئەوینی خۆی بە سافۆ بنوێنێ. لە یەکێک لە شێعرەکانی دا ئاوا باسی دەکا:

سافۆ

بە گوڵە وەنەوشەی لای بسکەکانی‌یەوە

بە بزەیەکی شیرینی لە گوێن شیلەی هەنگ و...

لە مەڕ ناوی سافۆشەوە هەندێک دڕدۆنگی لە ئارا دایە. بە زمانی یوونانی ئایۆلی کە زمانی زکماکی سافۆ بووە، ناویان بە "سافا" نووسیوە و لە یوونانی "ئاتێن"یش‌دا بە سافۆ هاتووە. لە پاپیرۆسیک‌دا کە هی ٥٠٠ ساڵ بەر لە زایینە هەر بە سافا نووسراوە، بەڵام لەسەر زۆربەی سککەکان و هێندێک قاپ و گوڵدانی کەونارا بە سافۆ ناویان بردووە. بە پێی نەریتی باوی بێژکردن و نووسینی ناوەکانی ئوروو‌پایی، ئەو ناوە لە تاقمێک لە سەرچاوەکان‌دا بە Sappho نووسراوەتەوە.

لە سەدەی چوارەمی زایینی‌دا ئوستوورە و ئەفسانەگەلێکی زۆر لەمەڕ کەسایەتی سافۆوە بەدی‌هاتن، وەک ئەوەی کە ئەو ژنێکی سۆزانی بوو، یان ژنێک بوو کە بە هۆی ئەوەی ئەویندارى پیاوێکی زریڤان بە ناوی "فائۆن" بووە، لە تاوی ئەو لەسەر گاشەبەردێکەوە خۆی تووڕ هەڵداوەتە خوارێ، یان ئەوەی کە دوو سافۆ هەبوون کە یەکیان شاعیر و ئەوی دیکە ژنێکی دەوڵەمەند بووە، یان ئەوەی کە ئەو ژنێکی ناحەز و ناشیرین بووە.

"ماکسیمۆس تیروسی" بە: سافۆی جوان ناوی دێنێ. چونکە "سوقرات" لە بەر جوانی شێعرەکانی و کەسایەتی خۆی پێی خۆش بوو وای پێ بڵێ، لە

کاتێکدا ئەو کورتە باڵا و رەشئەسمەر بوو. نووسەرێکی تری کەونارا دەڵێ: سافۆ نەقوستان بووە و بە بولبولی باڵکراو و مرۆڤی بستەباڵای دەشوبهێنێ.

"و. ی. ب دوبوا" رۆشنبیری "ئافرۆ-ئامریکایی" بە پێی نووسراوەی "ئۆیدیۆس" دەڵێ: سافۆ قولەڕەش بووە. ئەو سافۆ لە گەڵ "ئاندرومدا" کچی پادشای "ئیتیۆپی" هەڵدەسەنگێنێ. هیچ شکێک لەوەدا نییە کە خەڵکی"ئائۆرلی" دوڕرە بوون و لە گەڵ پێوەری ئاتێنییەکان؛ واتە باڵای بەرز و قژی کاڵ نەدەگونجان، بەڵام قولەڕەش بوونی سافۆ دوور لە راستەقینەیە.

ئەوەی کە سافۆ ورد و کورتەباڵا بووە، دەکرێ بڵێین لەو شێعرەی خۆی رایە کە دەڵێ: دەستەکانی ناگاتە ئاسمان، چونکە ئەو یەگجار وردیلەیە. بەڵام پرسیارێک کە لێرەدا قوت دەبێتەوە ئەوەیە کە داخۆ ئەو باسی جەستەی خۆی دەکا یان لە هەمبەر کاکەشانەکانی گەورەی جیهان خۆی بە بچووک دەزانێ؟

روخساری سافۆ لەسەر سککەکان بە جوانی خاتووخودای ئافرۆدیت نەخشێندراوە. جوانی دەروونی سافۆش هەم لە وتەی هاوچاخەکانی دەردەکەوێ و هەم لە شێعرەکانی خۆیدا.

کۆمێدی نووسانی سەدەی چواری بەر لە زایین، وەک "ئامفیس" و "ئانتی پانس" و هێندێک کەسی دی سافۆ و شێعری سافۆیان دەدا بەر تیری تانە و تەشەر و ئاتێنییەکان زۆریان گاڵتەیان بەوە دەکرد ژنێک بتوانێ هەستە تاکەکەسییەکانی خۆی دەربڕێ. بە تایبەت کە پیاوان لە شانۆ

کۆمێدیـیەکاندا رۆڵـی ژنانیـان دەگێـڕا. نووسـەران نـەوەک هـەر گاڵتـەیان بـە کەسایەتی سافۆ دەکرد، بەڵکوو زمانی شیعری ئەویشیان بە زمانی شیعری سۆزانییەکان دەزانی. تەنانـەت جاروبـار حیکایـەت گـەلێکی زۆر لـە پێوەندی هاوجسنخوازانەی ئەو بە راشکاوی لە لایەن ئەو پیاوانـەوە دەگێڕدراوە، کـە نیشاندەری جۆری تێگەیشتنی ئەوان لە شێعرەکانی سافۆ بوو.

ئـەم خاڵـە کۆمـەڵگای پیاوانـەی "ئـاتێن" و ئەوانـەی گاڵتـەیان بـە سـافۆ دەکـرد بـە ئێمـە دەناسـێنێ. بـە رای وان، ناوبانـگ و مەزنایـەتی سـافۆ بـۆ کەسـایەتی بـە توانـای پیـاوانی ئـەو کاتـە جێـی مەترسـی بـوو. ئـەوەی کـە کۆمێدییەکان پێی دەگەیشتن ئـەوە بـوو کـە ئەگـەر بێتـوو کۆمەڵگایـەک بهێڵـێ ژنان هەستەکانی خۆیان دەرببڕن، ناکرێ چاوەڕوانییەکی وات لێی هەبێ.

حـوکمدانی راشـکاو و راسـتەوخۆ لەسـەر نووسـراوەکانی سـافۆ لـە دونیای مەسیحییەتدا وەدی هـات، بـەڵام ئـەم نووسـراوانە هـەرچۆنێک بـوو، چاخەکانی ناوەڕاست و چاخی ویکتۆڕیای تێپەڕ کرد و تـا ئێسـتاش بەشـێک لـە نووسـراوەکانی لـە بەردەسـتن. مەسـیحییەتی ئـەوڵ هـەر لـەپێشدا نووسراوەکانی سافۆی رەت کردەوە. "تاتیانووس" نووسیویەتی کە لە ساڵی ٣٨ی زایینـی‌دا، ئۆسـقۆفی شـاری کونستانتینوپۆل(قەستەنتەنییە)"سـێنت گرێگۆریۆس نازیاترۆس" ئەمری کرد تا هەموو پەڕتووکەکانی شێعری سافۆ بکەنـە دەسـتەچیلەی ئـاور و ئـەو کارەشـیان کـرد و گڕیـان لـە خـەرمانی بەرهەمەکانی ئەو یەکەم ژنە شاعیرەی جیهانی کەونارا بەردا.

لە ساڵی ٣٩١ی زایینیدا، مەسیحییەکان هەموو ئەو کتێبخانانەی "ئەسکەندەرییە"یان سووتاند کە نووسراوەی نووسەرانی کلاسیکییان تێدابوو. ئەوەش کە لە ساڵی ٧٣٠ زایینی جارێکی تر پاشماوەی پەڕتووکەکانی سافۆ لەسەر ئەمری "پاپ گریگوریووسی حەوتەم" لە رۆم و "قەستەنتەنییە" ئاوری تێبەر درا، نیشاندەری ئەوەیە کە شێعری سافۆ تا ئەو کاتەش هەر لە بەر دەستان بوون. لە چوارەمین شەڕی سەلیبیدا کە سەردارە وێنیزییەکان شاری "قەستەنتەنییە"یان تالان کرد، ئەوەی کە بەجێ ما، لە ساڵی ١٤٥٣، پاش سەرکەوتنی تورکەکان بە سەر "بیزانس"دا، بە غەنیمەتی ئەوان چوو. وێدەچێ کە ئێستاش کتێب و شێعرەکانی سافۆ لە تورکیا هەر مابن. گرینگتریش ئەوەیە کە ئەو بیرۆکەیەش بەهێزە کە رەنگە ئێستاش لە ئارشیوی کتێبخانەی "واتیکان" لانیکەم دەستنووسێک لە نووسراوەکانی سافۆ پارێزرابێ، بە تایبەت وەک بەڵگەیەک لە گوناحی شێعر و کەسایەتی شاعیر. ناکرێ بڕوا بکەین کە واتیکان هەموو ئەو بەرهەمانەی بە نووسراوەی لاڕێ و چەوتی دەزانین و یاساغی دەکردن، لە ناوی بردبێتن. کلیساکان تەنانەت بەڵگەکانی تاوانیش دەپارێزن. کتێبدارەکانی هەموو جیهان، کتێب و نووسراوە و کاغەز ناسووتێنن، بەڵکوو لە شوێنێک دەیشارنەوە.

سافۆ و نووسراوەکانی بێجگە لە دوژمنانی سەرەکی ئایینی، قوربانیی دارمانی کۆشکی زانست لە سەدەکانی ناوەڕاست و هەروەها تێپەڕینی زەمانیش بوون. بە پێی روونکردنەوەی سەرچاوە مێژوویییەکان، هیچ

کتێبێکی تەواو و کامڵ لە نووسراوەکانی لە بەردەستدا نییە. ئەو بەشە لە نووسراوەکانی سافۆ کە تا ئێستا دۆزراونەتەوە، بریتین لە هەندێک کۆپلە شێعر و وشە و دێڕی بە واتا و دڵبزوین، کە لە لایەن نووسەرانی یوونانی و رۆمەوە کۆکراونەتەوە. بەشێکی زۆر لە نوسراوەکانی کە لەسەر پاپیرۆس نووسراون دیتراونەتەوە، کە لەوانەش هێندێکیان بە هۆی کارتێکەری کەشوهەوای شوێنی راگیرانیان لە ناو چوون. لە پێنجسەد شێعر، تەنیا پێنجسەد بەشی بچووکی خوێندراوەتەوە.

سەرەڕای هەمووی ئەوانە ناکرێ ئەو سەدەیە لەگەڵ سەدەیەکی تر هەڵبسەنگێندرێ. سافۆ شاعیری هەمو چاخەکانە و ئامێزی هەموو زەمانەکان بە رووی‌دا کراوەیە. ئەو لە کاتی ژیانی‌دا بۆ زۆربەی خەڵک جێگەی رێز بووە و هەر بەو شێوەیەی بۆخۆی دەڵێ پاش مەرگیش لە بیر ناچێتەوە. نووسەران و شاعێرانێکی زۆر ویستوویانە ئەو قسەیە نەسەلمێنن و مەرگی ئەدەبی سافۆ رابگەیەنن، بەڵام سافۆ خۆی ئەوەی سەلماندووە و ئەمرۆش وەک ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر بیر و شێعری هەر نوێیە. جا چ هاوجسن‌خواز بووبێ و چ راهیبە، گرینگ نییە، ئەوەی گرینگ و شیاوی لێوردبوونەوەیە، پێکهاتەی پتەو و بیری بەرزی شاعیرانەی ئەو ژنە بلیمەتەیە لە دوو توێی شێعرەکانی‌دا.

# چەپکە شێعرێکی "سافۆ"

١

خۆشم دەوێ

هەر شتێک منی خۆش بوێ.

من پێم وایە

ئەوین

بەشێکی لە هەتاو پێبڕاوە.

٢

هۆ وشەکان

ئەگەر ئێوەش هێزوگوڕێکتان تێدا بێ

زمانی من نەمرتان دەکا.

٣

بەیان

گوڵێکی تاوسی زێڕین بوو

بە دەم ئاسۆگ و دەریاوە.

٤

نیوەڕۆیان
ئەو دەمەی هالاوی گەرما
دەکەوێ و
ئەستوونی خاک دەتوێتەوە،
ئاهەنگێک ساز دەکەن سیسرکەکان
بەلێکدانی باڵەکانیان
لە توێی"نیوپەردەیەک"دا.

٥

ئێوارانە
کیژۆڵەکان گوڵێک دەچنن
بە تەنیا هەر بۆ بووکەکان.

٦

هیسپرووس

ئەتۆ شوانی ئێوارانی

وەک رانە مەڕ دەیهێنیەوە بۆ ماڵێ

هەموو ئەو شتەی سپێدە

بەرەبەیان بڵاوی دەکاتەوە.

ئەتۆی کە خەو دەهێنیەوە بەرەو ماڵێ

هەر وەک مێگەلی مەڕ و بزنەکان.

هەر تۆش منداڵ

لە باوشی دایکی دەردێنێ.

٧

تریفە دەبەخشێ مانگ، بە شەوەکان
کیژەکانیش
جێگەیەک دەدۆزنەوە کە دانیشن
وەک ڕۆنیشتن لە دەوری میحڕابێک.

٨

ئەستێرەکان لە دەوری مانگ
روخساری رووناکی خۆیان دەشارنەوە
لە ناو لەپی دەستیاندا
ئەو دەمەی کە مانگی تەواو
لە ئاسمانەوە
بە تریفەکەی زێو دەڕێژێتە سەر عەرز.

٩

ئێسکی رانە قەڵەوەکانی
بزنێکی سپی
بۆ تۆ قوربانی دەکەم
لە چەقی میحرابتدا.

١٠

ئەستێرەکان هەڵدێن
وەک تەڵاشی پنجی دارە کاژەکان
لە ناو کوچکاوری مانگدا.
ئاگر پڕیشکەی لێدەبێتەوە و
پەل دەبزێوێ
هەتا زەوین.

١١

خەو

تاریکی چڕوپڕی خۆی دەڕێژێ

بەسەر چاوەکانی ئەودا.

سەری خستۆتە سەر مەمکی

کیژۆڵەیەک.

١٢

مانگ، سەرتاپێ زێڕپۆش

خزمەتکاری ئافرۆدیتە.

وێدەچێ شەو

هەر بۆ من درێژ بێتەوە.

١٣

خەو لێکدەنێ

چاوەکانی

لە شەوێکدا

لە شەوێکی تەواودا.

منیش لەناو پێخەفە نەرمەکەی خۆمدا

لەشی ماندووم

دەکێشمەوە.

١٤

مانگ و ئەستێرەی کۆ رۆچوون و

لە تاریکیدا خنکاون.

لە جامی شەو

کەلاو دەکا زەمان.

هەر من،

داخ و جەخار، هەر منم

کە تاق و تەنیا

دەچمە توێی نوێنی خەوەوە.

١٥

من پێم وایە کە تەنانەت

ناتوانم

ئاسمان بگرمە ئامێز.

١٦

هاتە لای پێخەفەکەم
بە"کاڵە"کانی یەوە ... بەیانی،
هەڵیشیستاندم
هەر ئەو کاتە.

١٧
نازانم بۆچی
دووپات بوومەتەوە.

١٨
لە خەیاڵدا
من لە گەڵت دواوم-گەلێک!
ئەی خاتووخودا، کیسپریس.

١٩

هۆ سافۆ
تۆ دەتوانی چی ببەخشی
بەو کەسەی کە خۆی بە وێنەی ئافرۆدیت
خاوەنی هەموو شتێکە؟

٢٠

ئەی کیپریس"
"کریتا" جێ بێڵە، وەرە
بۆ خۆت دەزانی بۆ کوێ،
لە ژێر تاجی گەڵاکاندا،
ئێرە دارستانی تۆیە.

٢١

لە میحراب دووکەڵ هەڵدەستێ و
ئاو دێتە خوار لە بەرزاییی
بە دەم سترانەوە لە ژێر دار بەهێکانەوە
بۆ ژێر سێبەری سوورەگوڵ.

خەو دەتکێ
لە خشەخشی گەڵاکان.
دەڕژێتە سەر خاک و
دەڕژێتە چاوەکانەوە.

لەوێ، لە بژوێنەکان
جوانووە ئەسپەکان دەلەوەڕن
لە بەهاری پڕ لە "سەرەخس" و "شەودەر"دا
-با- ش لە نێو گژوگیادا
هەر دەشنێتەوە.

وەرە، ئەی کیپریس، بەرەو لام

بەرەو ئێرە و بۆ لای من وەرە.

پیاڵەی زێڕینم بدەیە

لێواولێویان کە لە شەڕاب

لەو شتەی کە

هەر خوداکان دەیخۆنەوە.

٢٢

بۆ کچەکەم کلێئیس"

کلێئیس! لێم مەپرسە چی بپۆشی!؟
من دەسماڵی گوڵدۆزیکراوی "ساردیسی"م نییە
تاکوو بە دیاری بتدەمێ
لەو دەسماڵەی خۆم پۆشیومە.
دایکم هەمیشە هەر دەیکوت:
لە سەردەمی ئێمەدا تەنیا بەستنی پەلکەکانمان
بە دەسرەیەکی ئەرخەوانی
هێمای گەورەماڵی و شکۆ بو.
بەڵام نەمان دەفامی ئێمە
ئەو کیژەی کە
قژەکانی زێرینترە لە گڕی فانووس
هەرگیز نابێ بۆ رازاندنەوەی قژی
شتێک جگە لە گوڵی تازە
هەڵاوەسێ.

٢٣

"بۆ تیماس"

ئێمە ئەو کووزوویە و ئەو نووسراوەیە

لە سەر ئەو پاپۆڕە دادەنێین.

ئەوە خۆڵەمێشی "تیماس"ی بچووکە

کە جوانەمەرگ

بەرەو شوێنی خەوی تاریکی پێرسەفوون

بەڕێکرا و

ئەو

لە ماڵی خۆی دوور بوو

کیژەکانی هاوتەمەنی

تیغە زاخاو دراوەکانیان هەڵگرت

تا بە دابی تازیەباری

چەپک چەپک قژە خاوەکانیان ببڕن.

٢٤

خۆ تۆ ئێرە دەزانی
کەوابو "کرێت" جێ بێڵە و وەرە ئێرە.
لێرە کە چاوەڕێت دەکەین.
ئێرە لە بۆ تۆ پیرۆزە
ئێرە کە دەنکەکانی ئەسپەندەر
لە پێش میحراب
بە بۆن و بەرامەوە دەشنێتەوە و
کانیلە فێنکەکان
لە ناو لقەکانی دار سێودا
بەدەم سترانەوە دەخوشن و
ئەو پنچکە جوان و چڕ و پڕەی سوورەگوڵ
سێبەر دەخاتە سەر زەوی.
گەڵاکانیش بە دەم سەماوە
خەوێکی قووڵ دادەبارن.
لێرە کە لە پێدەشت و مێرگەکان
ئەسپەکان دەحیلێنن.

٢٥

ئەو مەزنترە لە قارەمانێک.
لەچاوی مندا ئەو خوایە
ئەو کە دەتوانێ لە لات دانیشێ و
عاشقانە گوێ بداتە
زەمزەمەی شیرینی دەنگت
ئاوازی پێکەنینی دڵڕفینت
کە دڵەکوتەی من توندتر دەکا.

٢٦

تامەزرۆم و
لە تامەزرۆییدا بوومە خەڵووز
تۆی ئەو کەسەی
کەبابم دە... *

*ئەو شێعرە لە بەردەنووسەکەی سافۆدا ئاوا ناتەواوە و بەشی کۆتایی سواوەو نەخوێندراوەتەوە.

سەرچاوەکان:

١- سافو شاعرەی یونانی دوران باستان، ترجمه علی عبدالهی، مجله نافه، شماره٢٦، ص٤٩-٥١

٢- سافو نخستین زن شاعر، ترجمه پیرایه یغمایی، برگرفته از کتابwomen poems، ص٤١-٤٢ www. mesyeux. blogfa. com))

٣- مختصری درباره سافو، ترجمه علی ثباتی، برگرفته از دایرهالمعارف بریتانیکا، (www. vazna. com)

٤- www. fa. wikipedia. org زیرعنوان "سافو"

# گۆرانییەکانی بیلیتیس

## شێعر و ژیانی بیلیتیس، شاعیری کەونارا



بیلیتیس ژنە شاعیری هەڵکەوتەی یۆنانییە کە هاوکات لە گەڵ سافۆ و بەوتەیەک ٦٠٠ تا ٧٠٠ ساڵ بەر لە زایین لە رۆژئاوای یۆنانی‌نشینی ئاسیای بچووک لەدایکبووە. لەتەمەنی شازدە ساڵان رێی دەکەوێتە دوورگەی لێسبۆس و لەگەڵ سافۆ ناسیاوی پەیدا دەکا و عاشقی رەفتار و شێوە نووسینی دەبێ. بەرهەمەێک کە کۆی نووسینەکانی تێدا بڵاوکراوەتەوە بە ناوی گۆرانی‌یەکانی بیلیتیس، لە ناو هەموو گەلانی دونیادا ناسراوە و زۆربەی شاعیرانی جیهان توانایی لە رادەبەدەری بیلیتیسیان ستایش کردووە. بۆ وێنە شاعیری ئێرانی فرووغی فەرڕوخزاد دەڵێ: تەنیا کتێبێک کە هەرگیز لە خوێندنەوەی ماندوو نابم گۆرانی‌یەکانی بیلیتیسە." شێعری بیلیتیسیش وەک شێعری سافۆ پڕە لە هەستی ژنانە و ئەو شێوە دەربڕینە بە درێژایی مێژوو کێشەهەلاییسێن بووە و زۆر کۆمەڵگا وەک تابۆ و بڤە لێیان روانیوە. هەر بۆیە بە پێی روانگەی کلتووره جیاوازەکان و تاکە جیاوازەکان، ناسناوی جوداشیان بە بیلیتیس داوە، لە سۆزانی‌یەوە تا خاتووخودای هونەر و ئەوین.

# هەر لەبەر تۆ

دارستانی جوان!

چاوت بە خۆشەویستەکەم نەکەوتووە

کە بڕیار بوو بێتە ئێرە؟

-بەڵێ دیتم لێرە رابرد و رووی لە دەشت و سەحرا کرد.

دەشتی بێدەنگ!

دڵداری ئەمنت نەدیوە؟

_بەدی، بەستێنی چۆمی گرتەبەر و رۆی.

چۆمی رووناک!

چت لە خۆشەویستەکەی ئەمن کرد؟

_نازانم لە نێوەی رێدا

لە من جیابۆوە و بەرەو جادە چوو.

هۆ جادەی گەورە!

بێشک ئێستاکەش یارم هاودەمی تۆیە؟

_ جەخار، ماوەیەک لەوەپێش

بەجێی‌هێشتم و ڕێگای بچووکی شاری گرتە بەر

تۆ دەڵێی چی ڕێگای سپی و ڕووناکی شار؟
جوانەکەی منت گەیاندووەتە کوێ؟
- نازانێ دەنا سوپاسم دەکەی،
ئەوم گەیاندە کۆلانێکی زێڕین کە دەچێتە "سارد"

ئۆوەی، هۆ کۆلانی زێڕین!
ئەرێ ئێستاش دڵدارەکەم
بە پێی پەتی بە سەر تۆ دا هەنگاو دەنێ؟
-نا، چونکە چەند سات لەمەوبەر یارەکەت چۆتە کۆشکی شا

هۆ کۆشک! هۆ ڕووگەی هەموو ڕووی زەمین!
دڵدارەکەمم بدەوە
_ئێستا دڵدارەکەت سەرتاپێ لە جەواهێردا نوقمە
ملوێنکێکی گرانبایی لە مل دایە
بسکەکانی بە تاجی ئەڵماس و زومڕووت ڕازاونەوە و
دوو باسکی پیاوانەش لە ئامێزیان گرتووە
پێت وایە ئەو هەمووە شتە هەر لە بەر تۆ جێ دەهێڵێ؟

# مەرگی دڵ

ئەی زوهرە! ئەی خاتووخودای دڵڕەق!
عاقیبەت تۆ وات مەیل لێبوو کە دڵی ئەمنیش بمرێ
دەستوورتدا نەمامی لاویم وشک بێ و
بسکەکانم بریقەی خۆیان لە بیر بەرنەوە
ئەورۆ لە ئاوێنەدا چاوم لە خۆم کرد
نە ئەسرینێکم بۆ مابۆوە و نە بزە
چۆن بڕوا بکەم سەردەمێک ئەو روخسارە
رووگەی گشت جوانخاسان بووە؟
ئەرێ داخوا دەفتەری جوانیم بۆ هەمیشە داخرا؟
خۆ من هێشتا پێنجەمین هەشت ساڵەی ژیانم رانەبواردووە
چۆن بڕوا بکەم  ئیتر کەس منی ناوێ؟
ئەی زوهرەی جوان! رەمزی هەرمان!
ئەو بسکە براوانەی خۆم
 کە لە پشتوێنکەمدا شاردومەتەوە
پێشکەشی بارەگات دەکەم
چون هەموو کاتی تەمەنم

هەر وەفاداری تۆ بوومە

لەوە بەولاش هەر وەفاداری تۆ دەبم

بەڵام تازە ئەوی لە عومری من ماوە

من قەت بە عومری نازانم

چونکە سەردەمی جوانی من بەسەر چووە

چون لە کاتی لاوەتیم زۆر رابردووە

ئەوە دوامین شێعری بیلیتیسی جوانە

ئەو کەسەی کە

خزمەتکاری وەفاداری

خاتووخودای ئەوین و جوانی هەرمانە.

# سێ کەس بەر لە تۆ، بەڵام تۆ

کچێکی جوان بە خۆشەویستەکەی خۆی گوت:
دڵدارەکەم!
بەر لە ئێستاش سێ کەس بە دڵ خۆشیان ویستووم
یەکیان ملوێنکێکی گەوهەری هێنا
کە شارێکی بە هەموو کۆشک و پەرەستەگەکانییەوە دێنا
بۆوەی لە ملی جوانمدا ترووسکەی بێ.
یەکیان هەستی زۆر ناسک بوو
بە شێعری جوان،
کوتی بسکی من لە ئەگریچەی شەوەزەنگ زۆر رەشترە
روخساریشم
لە تریفەی مانگی هاوین زۆر گەشترە
ئەوی تریان کە جوانی و خوێن شیرینی من
نەدەگەیشتە خاکی پێی
لە ئاست جوانیمدا کڕنۆشی برد و

لاقە رووتەکانمی ماچ کرد

خۆشەویستم!

ئەی ئەو کەسەی لە گشت جیهان نیان‌تری

تۆ نەجوانی، نە زێڕت هەیە و نە هەستی شاعیرانە

هەتا وەسفی قەد و باڵامی پێ بکەی

بەڵام ئێستاش لەبەرچاوم

تۆ لە هەموویان جوان‌تری.

# بێ ئۆقرەیی

لەو هەموو گریانەی ڕشتمە ئامێزی‌یەوە
کڵپەی دڵم دیتەوە بە سەر شانی‌یەوە
بەر لەوەی لە ترسان زمانم بگەڕێ
ئاخ کە من منداڵۆچکەیەکم و
پیاوانی شۆخ بە بێ ڕوانین لە لامەوە تێدەپەڕن
کەی دەتوانم دوو مەمەکم بێ جوان و تورت بن وەکوو هی تۆ
کە کراسەکەم بدڕێنێ و
پیاوان لە دین وەرگەڕێنێ.
کەس چاوی تینووم تێنابڕێ
ئەو کاتەی با کراسەکەمم لە دەست دەفڕێنێ
کەس عاشقی ئەو گوڵانە نابێ لە بسکمەوە دەکەونە خوارێ
کەس پێم ناڵێ کە دەتکوژم ئەگەر لێوت وە لێوێکی تر بکەوێ
بە میهرەبانی‌یەوە وڵامی داوە:" بیلیتیس، کیژۆڵەی ئازیز
تۆ وەک پشیلەیەک لە ژێر مانگە شەودا دەگری

لە خۆڕا دڵەدوا مەبە

بە شوێن ئەویندا هەڵوەدا مەبە

چون ئەو کچانەی بێ ئۆقرەترن

درەنگتر هەڵیان دەبژێرن.

# بە یادی ئەو

من ئەتۆم خوارد، وەکوو هەنجیرێکی گەیو
خوردمیەوە، وەکوو شەربەتێک لە شەڕابی چاک
لەشی پڕ هەستی ئەتۆم گرتە ئامێزم
سەرم قاڵ بوو
بە قژی کورت و مەمکی تورت و لەشی ناسکت.
گۆی مەمکەکانت رەشتر لە خورمان.

ژن وەک خوێنی رەز تینوێتی پاراو دەکا
بە جوانی خۆی دلّدارەکانی راو دەکا
ئاخ تۆ خەوتووی لە نێو ئامێزی ئەمندا
وەکوو تارمایی خۆشەویستێکی دی
تۆ ناناسم
چون لە مابەینی لەشی تۆ و مندا
خولیای بەتینی ئەو داگیرم دەکا

تۆم وەک برینێک گرتە ئامێز و

بە یادی ئەو، فرمێسکەکانم هەڵوەراند

"مناسیدیکا! مناسیدیکا! مناسیدیکا"***

*** مناسیدیکا خۆشەویستی بیلیتیس بووە

# ئامێزی شێتانه

خۆشت بوێم

نه به بزه و دەنگی شمشاڵ و چەپکی گوڵەوه

به دڵت و به فرمێسکەکانت

به گەرمی هەناسەکانت

وەک چۆن من ئەتۆم خۆش دەوێ

به ئامێزی نەرم و جوانم و

به پرمه پرمی گریانم.

ئەو دەمانەی سینگت له سینگم دەخشێنی

ئەو کاتانەی به خۆشەویستیت سوکناییم به دڵ دێنی

ئەو دەمانەی ئەژنۆکانت به پشتمەوه دەنووسێنی

دەمی تینووم

تینوێتی تۆ هەست پێدەکا

دڵه کوتەم له پاڵ تۆوه دەست پێدەکا

له ئامێزم بگره وەک چۆن ئەمن له ئامێزت دەگرم

بڕوانە ئێمە کاتی خەو

لە ژێر تریفەی مانگە شەو

دەتلێینەوە و مۆمێک نییە،

لەشی ئاگرینت لە ئامێز دەگرم و

دەنگی هەناسەی نەرمت لە گوێدا رادەگرم

هەر دەنگت بێ، هەر دەنگت بێ و بناڵێنە

چون ئەو ژانە قورسە خەڵاتی ئێرووسە

ئەو ژانەی کاتی زان بە لەشتدا دێ

لەو هاوئامێزییەدا کەمترە

لە ژانێک

کاتی دەستپێکردنی ئەوین

لە لەشتدا دەگەڕێ.

سەرچاوە:

١- بیلیتیس(١٣٥٦) بهتر از همه، ترجمەی یکی از ترانەهای شاعرەی یونانی، مترجم حالت، ابولقاسم ، مجله گوهر شماره ٥٦

٢- بیلیتیس(١٣٢٩)ترانەهای بیلی‌تیس، ترجمه شجاع‌الدین شفا، تهران: آثار جاویدان،

٣-بیلیتیس(١٣٩٠)ترجمه سه شعر از بیلیتیس، مترجم یاسمین حمشدری، سایت رویانز

٤-فرخزاد،فروغ(١٣٩١)نامەای از فروغ به مجله فردوسی،(با اشاره به بیلیتیس) http://irwomen.blogfa.com/post/8

# لە بەر دەرِوازەی کرێملین شین دەگێرِم

## ژیان و شێعری ئانا ئاخماتووا



ئانا ئاخماتوا لەو شاعیرانەیە کە دەتوانین بە وردبوونەوە لە کەلێن و قوژبنی ژیانی، سەربوردەی نەسلێک شیکەینەوە؛ نەسلێک کە دوابەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبری رووسییە بە خێرایی و لە ماوەی چەند ساڵدا، لە هەموو ئاڕمانجە شۆڕشگێڕییەکانی دوور دەکەوێتەوە و دەبێتە شایەد و بینەری کووژران و قەلاچۆ و ئاوارەیی و بێدەنگی باشترین و بە ئەمەگترین رۆڵەکانی. یەکێک لەو رۆڵە بوێر و بەمرخانە ئانا ئاخماتوا بوو؛ ژنێک کە تەواوی ژیانی خۆی هەر لە تەمەنی لاوییەوە لە قالبی شێعردا مانا کردەوە و روانینیشی بۆ دونیای دەوروبەری یەکپارچە شاعیرانە یان باشتر وایە بڵێین شێعر بوو. شێعرێکی پەتی و تایبەت. "ئانا ئاندریو ناگارنیکۆ" ژنێکی لاو بوو، کاتێکیش ویستی ببێتە شاعیر، ناوی دایەگەورەی بە قەرز وەرگرت و لەسەر خۆی دانا، ئەوەش بە پێشنیاری باوکی بوو. چونکە باوکی لەوە دەترسا ئانا هەر بە خەیاڵی خۆی شاعیر بێ و هیچی لەباراندا نەبێ. بەڵام ئانا وەهای توانایی خۆی بە باوکی سەلماند کە بۆ هەمیشە ناوی دایەگەورەی لە مێژوودا تۆمار کراو و ناوی باوکیشی تۆزی زەمانی لە سەر نیشت و لە بیر چۆوە و ئیتر کەس لە کوولەکەی تەریشدا ناوی نەهێنا. باپیری دایکی ئانا ناوی "ئەحمەدخان" بوو. ئەحمەدخان بە رەچەڵەک دەچۆوە سەر خانەکانی تاتار و بە چەند پشت دەگەیشتەوە سەر چەنگیزخانی موغۆل. ناوی ئەحمەدخان بە رووسی دەبووە "ئاخمات" و هەر ئەو ناوەشە کە پاشان ئانا وەک نازناوی خۆی هەڵیدەبژێرێ و پێی دەناسرێ.

ئانا پلە و پایەیەکی بۆخۆی لە جیهانی ئەدەبیاتدا دەستەبەر کرد کە ئەورۆکە وەک قۆچکی سێ گۆشەیەکی دەناسن کە دوو گۆشەکەی دیکەی "ماندلشتایم" و "مایاکۆفسکی"ن و هەر سێکیان پێکەوە گرووپی شاعیرانی گەورەی رووسییە پێکدێنن.

ئانا هەموو شتێکی بە شێعر لێکدەداوە و جیهانی دەوروبەری بەو وشانە شیدەکردەوە کە لە ناخیدا دەنگیان دەداوە. یەکێک لە ناسراوترین شێعرەکانی، شێعرێکە بە ناوی " ئەو سێ شتی پێخۆش نەبوو". ئانا بەو شێعرە وەسفی مێردەکەی دەکا و دەڵێ:

ئەو لەو دونیایەدا سێ شتی پێخۆش نەبوو

گریانی منداڵ و

مرەببای توورترک لە گەڵ چا و

شەڕ و کێشەی ژنان و

من ژنی بووم...

کاتێک "ئاخماتووا" یەکەمین کۆمەڵە شێعری خۆی لە ساڵی ١٩١٢دا بە نێوی "شەوگار" لە چاپدا، ٢٣ ساڵی تەمەن بوو، لە کۆڕ و کۆبوونەوە ئەدەبییەکانی ئەو کاتدا نێوی کەوتبووە نێو نێوان. تا ئەو کاتە هەندێک شێعری لە گۆڤارە ئەدەبییەکانی ئەو سەردەمەدا چاپ کرابوو. بێجگە لەوەش دۆستایەتی ئەو لە گەڵ "گۆمیلیۆف" کە یەکێک بوو لە شاعیرە ئاژاوەگێڕ و نێوبەدەرەوەکانی ئەو کاتە، "ئاخماتووا"ی بە ناوبانگتر کردبوو. رووسیا لە بەرەژانی شۆڕش و گۆڕانکارییە قووڵەکاندا بوو. هێزی بەرەنگاری و دژی

قەیسەر، پاش تێکشکانەکەی ١٩٠٥ خەریکی ئەوە بوو خۆی بۆ هەڵمەتێکی بەرینتر تەیار بکا. شێعری رووسیای ئەو سەردەمە بە سەرۆکایەتی "بیریووسۆف" و "ئێلکساندر بلووک" لە ژێر چۆکی بێ ئەملاوئەولای سەمبۆلیزم دابوو.

بەڵام هێماخوازی و شاراوە ویژی و رەمز و نهێنی سەمبۆلیزم، بۆ کۆمەڵگای پڕ لە جووڵە و زیندوو و شۆڕشگێڕی ئەو دەمەی رووسیا لەبار نەبوو. جموجۆڵی بەرچاوی کۆمەڵایەتی لە ئەدەبیات و هونەریشدا پێویستی بە راشکاوی و نەشاراوەیی بوو. لە سەر بنەمای پێداویستییەکی وەها بوو، کە دوو قوتابخانەی "فۆتۆریسم" و "ئاکمەئیسم" بە دژی سەمبۆلیزم وەدی هاتن.

فۆتۆریسم پنج و بنەمایەکی ئیتالیایی هەبوو. لەو ساڵانەدا "ئیمیلیۆ فیلیپۆ مارینێتی" لە ئیتالیا قوتابخانەی فۆتۆریسمی دامەزراندبوو، مانیفێستەکەشی ساڵی ١٩٠٩ لە گۆڤاری "فیگارۆ"ی پاریسدا بڵاو کردبووە. ئەو قوتابخانەیە بەو بڕوایەوە کە ئیتر چاخی ماشینیزمی نوێ، گۆڕەپانی درکاندنی هەستە رۆمانسی و پڕ لە نهێنییەکان نییە، راستەوخۆ هەڵمەتی کردە سەر سەمبۆلیزمی فەڕانسەوی و بە وەلانانی ئەو یاسا رێزمانی و ئەدەبییانەی لە شێعردا خەڵک خوویان پێ گرتبوو. هەندێک قاڵبی نوێی شێعری پێکهێنا، بەڵام تەنیا سەرنجدانی ئەو قوتابخانەیە بە فۆڕم و کاریگەرییەک کە لە نیچە و تیۆری کەڵەپیاوی ئەوی وەرگرتبوو، ئەم قوتابخانەیەی کردە یەکێک لە کاریترین قوتابخانە ئەدەبییەکانی ئیتالیای

سەردەمی مووسوولینی. بەڵام لە رووسیا "مایاکۆفسکی "و "خەلبینکۆف" لەو قوتابخانەیە وەک شۆڕشێک لە فۆڕمی شیعردا کەڵکیان وەرگرت و بە وەکارهێنانی بۆچوونە گشتییەکانی فۆتۆریسم، شیعریان لە دژواری و پێچیاوی رزگار کرد و لە زمانی باوی ئاخاوتنی رۆژانەیان نزیک کردەوە. "مایاکۆفسکی" بە دەکارکردنی وشەی ناسراو و تایبەتی و بەدوور لە جوانکارییەکانی سەمبۆلیک، وێڕای پێکهێنانی گۆڕانکاری لە خاڵدانان و درێژ و کورتی دێڕەکان، شیعری کردە چەکی شۆڕش. بەڵام بزووتنەوەی "ئاکمەئیسم" لە بنەڕەتەوە رووسی بوو. "گۆمیلیۆف"، "سێرگێئی گرۆدتێسکی"، "ئۆزیپماندلشتایم"، ئانا ئاخماتووا"، "بووریس پاستێرناک" و چەند کەسێکی دی، بۆ دژایەتی لە گەڵ سەمبۆلیزم ئەو قوتابخانەیەیان بنیات نا. بە پێچەوانەی فۆتۆریستەکان " ئەوان بە شوێن گرتنەبەری رێبازێکی شۆڕشگێڕانە و کەڵک وەرگرتن لەو رێبازە بۆ راپەڕین و شۆڕش نەبوون. لە راگەیەنراوی ئەواندا ئاوا هاتبوو: بە رای ئێمە گوڵی سوور بە هۆی گەڵا و رەنگ و بەرامەی خۆی سەرلەنوێ بووەتەوە گوڵێکی سووری راستی و هیچ پێوەندییەکی بە ئەوینی پڕ لە نهێنی، یان هیچ شتێکی دیکەی لەو بابەتەوە نییە. "ئاخماتووا " کە نەیدەویست بچێتە ریزی هونەرمەندان و شاعیرانی شۆڕشگێڕەوە، تێکەڵ ریزەکانی ئەو قوتابخانەیە بوو. پاشانیش لە گەڵ "گۆمیلیۆف" کە یەکێک بوو لە پێشەنگەکانی ئەو قوتابخانەیە زەماوەندی کرد. نائارامی و ناسەقامگیری شۆڕشەکە بووە هۆی ئەوەی بابەتێکی وەک ئەوەی کە هونەرمەندان دەبێ تەنیا سەرقاڵی هونەر بن، بە سانایی

وەرنـــەگیرێ و بـــۆ زۆربـــەی هونەرمەنـــدەکان و بـــە تایبـــەت "گۆمیلیـــۆف" بەرەورووبوونـەوە لـە گـەڵ وەها بابـەتێک دژوار بـوو. بـەڵام ئـەو کـە پیاوێک بوو سـەری لە کێشە دەخورا، چووە ریزی دژە شۆڕشـەکانەوە. سـاڵی ١٩١٢ "لـوو" کـوڕە گـەورەی "ئاخمـاتووا" و " گۆمیلیـۆف" لـەدایکبـوو. " گۆمیلیۆف" چووە نێو ئەرتەشـەوە و زۆربـەی کاتـەکانی خـۆی بـە راپەڕاندنی کاروبـاری سەربازی‌یەوە رادەبوارد.

ئاخمـاتووا سـاڵی ١٩١٤ دووهـەمین کۆمەڵـە شـێعری خـۆی بـە نـاوی "تەسبێح" بڵاوکردەوە. ئەو کۆمەڵە شێعرەش پێشوازی‌یەکی بێ‌وێنـەی لێ‌کرا. "تەسـبێح" کۆمەڵـە شـێعرێکی ئەویندانەیـە و هـەموو شـێعرەکان بریتی‌یـە لـە ئەوین و سەرخۆشی و تێکشکان لە ئەویندا.

شۆڕشـــی ئۆکتـــۆبری ١٩١٧ سەرانســـەری رووســـیای هەژانـــد. شەونشـینی‌یە ئـەدەبی و شـەوە شـێعرەکان جێـی خۆیـان دا بـە کۆبووبـەوەی گـەرموگوڕی سیاسـی. شـاعیرانێکی وەک "ئاخمـاتووا" کـە تـا ئـەو کـاتیش لـەو هەژانـە بـە دوور بـوون، زۆر دەگمـەن بـوون. هـەر لـەو سـاڵەدا "ئاخمـاتووا" سێهەمین کۆمەڵـە شـێعری خـۆی بـە نـاوی "رەوەی باڵندە سپی‌یەکان " بـڵاو دەکاتەوە. بڵاو بوونـەوەی ئـەو کتێبـە چەند مانگ بـەر لـە شـۆڕش بـوو، هـەر بۆیە بە هێند نەگیرا و سەرنجێکی شیاوی پێ نەدرا. بە پێچەوانـەی "شـەوگار" و "تەسـبێح" کـە چەنـد جـار لـە چـاپ درانـەوە، کتێبـی سـێهەمی ئـەو، لـە سـنوورەکانی "پیترۆگـراد" بـەو لاوەتـر نـەچوو و تەنانـەت نەگەیشـتە کتێبفرۆشـەکانی "مۆسـکۆ"ش. هەڵبـەت بـارودۆخی ئـاڵۆزی ئـەو سـەروبەندە

یەکێک لە هۆیەکانی پێشوازی نەکردن لەو کتێبە بوو. "ئاخماتووا" خۆی لەو بارەیەوە دەڵێ: هەم خوێنەران و هەم ڕەخنەگران لەمەڕ ئەو کتێبەوە بە ئینساف نەبوون و جوانیان هەڵنەسەنگاندووە. ئەو کتێبە لە بارودۆخێکدا بڵاو بووەوە، کە هەر ناکرێ لە گەڵ دۆخی کتێبەکانی پێشووم بەراوەرد بکرێ. هاتوچۆ بە تەواوی ڕاگیرا بوو، تەنانەت نەیانتوانی کتێبەکە بۆ مۆسکۆش بنێرن. گۆڤار و ڕۆژنامەکان هەموو ڕاگیرابوون و هەر بەو هۆیانەش بوو کە لە سەر ئەو کتێبە هیچ قسە و باسێک نەهاتە ئاراوە. پێم سەیرە بۆچی ئەوڕۆش کەس سەرنج ناداتە ئەو خاڵە.

ئاخماتووا پاش سێ ساڵ دوور بوونەوە لە مێردەکەی، کە لە مەیدانی شەڕ دابوو، لێی جودا بووەوە، سێ ساڵ دواتر چوارەمین کۆمەڵە شێعری خۆی بە ناوی "دار چنار" بڵاو کردەوە. هەر لەو کاتەدا "گۆمیلیۆف" گیرا و پاش موحاکەمەیەکی کورت بە تاوانی تێکۆشان بۆ لە ناوبردنی حوکومەت سزای ئیعدامی بۆ دەرچوو. پاش مردنی "گۆمیلیۆف" شک و دڕدۆنگی لە لایەن حوکومەتەوە سێبەری بە سەر ئانادا کێشا و ئیتر لەوە بەولاوە ساڵە پڕ جەزرەبەکانی ژیانی پڕ لە ترس و دڵەخورپەی ئانا دەستی پێکرد، لەچاپدانەوەی کتێبەکانی ئەستەم و دژوار بوو. بە بڕوای حوکومەت ئاخماتووا ژنی گۆمیلیۆفی دژە شۆڕشە، کە هەرگیز هیچ شێعرێکی بۆ شۆڕش نەهۆنیوەتەوە و لە گەڵ هونەرمەندانی دژە شۆڕشی وەکوو "ئۆزیپ ماندلشتایم" دۆستایەتی و هاتوچۆی هەیە.

ئاخماتووا لەو ساڵانەدا وەک هاوڕێی شاعیری خۆی "پاستێرناک" دەست دەکا بە وەرگێڕان و توێژینەوە، هەروەها ژیاننامە و لێکدانەوەی شێعرەکانی پووشکین بڵاو دەکاتەوە.

لە ساڵی ١٩٣٥ دا "لەوو"ی کوڕی دەستبەسەر دەکرێ و پاش ماوەیەکی کورت بەر دەبێ. بەڵام سەرلەنوێ بە وەپاڵنانی چەند تاوانی نادیار دەستبەسەر دەکرێتەوە. ئاخماتووا ئەو رۆژانە بە تاریکترین رۆژەکانی ژیانی خۆی دەزانێ. لەو سەروبەندەدا دەست دەکا بە نووسینی شێعری بەرز و بە ناوبانگی "سەردوولکە" و لە ساڵی ١٩٤٠دا تەواوی دەکا. بە رای تاقمێک لە رەخنەگران شێعری سەردوولکە یەکێکە لە شاکارەکانی شێعری مودێڕنی رووسیا:

ئەوان لە کازیوەی بەیانیدا بردیانی و
ئەمن بە شوێنتدا هاتم
دەتکوت بە دوای تابووکەتدا هەنگاو دەنێم
لە هۆدە تاریکەکاندا
منداڵان شیوەنیان دەکرد
مۆمیش دووکەڵی دەباراندە سەر روخساری پیرۆزی درەوشاوە

سارد، دواهەمین ماچ لە سەر روخساری پیرۆز
سارد، دڵۆپە عارەقەکانی سەر تەوێڵ
وەک ژنانی ئێستێرلیتسی

له بەر دەرِوازەی کرِێملین شین دەگێرِم

لەولاوەوتر، یەکێک ئەسرینی چاوانی دەسرِێتەوە.

گمەگمی کۆتری بەندیخانە دەتویێتەوە

سەهۆڵ دەجووڵی و "نێوا" دەبزوێ

بە خۆشانی هێورەوە بەرەو دەریا.

لە ساڵی ١٩٤٠ دا "لوو" بە بێتاوان دەناسرێ و بۆ بەشداربوون لە شەرِی نیشتمانی، لە گرتووخانە ئازاد دەکرێ. ئاخماتووا لە ساڵەکانی ١٩٤٠ تا ١٩٤٥ چەند شێعرێک لە مەرِ شەرِەوە دەهۆنێتەوە و یەکێک لە هۆنراوەکانی وەک سروودێکی نیشتمانی لە بەرەکانی شەرِدا دەکوترێتەوە:

چراکان کووژاونەتەوە

خەندەکی مەتەرێزەکان لە ناو خانووە باخەکاندا...

هەتیوەکانی پیترزبۆرگ

هەموو منداڵانی منن...

لەو ژێرخانەدا

سینگ هەناسەی دێتەوە بەر

ئێش و ژان لەسەر تەویڵ چل دەدەن

لە نێو گرمەی بۆمبەکاندا

دەنگی منداڵێک دەبیسرێ.

ئازادی "لوو" لە بەندیخانە و چاپی شێعرەکانی "شەرِ"ی ئاخماتووا لە گۆڤارەکاندا، هیوای تەواوبوونی مەودای قاچاخی شێعرەکانی ئانای

بەدیهێناوە. بەڵام پاش شەڕ، زەبروزەنگ لە پانتای ئەدەبیاتدا پەرە دەستێنێ. "ژێدانۆف" کومیساری کولتووری "ئیستالین" لە وتارێکی توندوتیژدا کە لە "لینیگراد" و "ئیزۆستیا" دا بڵاوی دەکاتەوە، "ئاخماتوا" و "میخائیل زوشچێنکۆ"ی تاوانبار کرد بە ناهۆگر بوون بە کولتووری شۆڕشەوە و تەنانەت ئاخماتووا بە شاعیرێکی نیمچە راهیب – نیمچە سۆزانی لە قەڵەم دەدا و هەروەها شێعرەکانی سەردەمی شەڕی ئەو، بەو بیانووەی کە دارماڵن لە ناهومێدی و هیوابڕاوی و بە دوورن لە هەموو هیوا و هاندانێک، بە هیچ دەزانێ. پاشان هەر بە پێشنیاری ئەو ئانایان لە شووڕای نووسەران وەدەرنا و بۆ جارێکی تر ترس باڵی بەسەر ژیانیدا کێشا.

دوای مردنی "ئیستالین" لە ساڵی ١٩٥٣دا، قەرەبووکردنەوەی رابردوو و گەڕاندنەوەی مەزنی و شکۆی ئەو سیاسەتمەدار و هونەرمەندانەی کە لە چاخی "ئیستالین"دا رقیان لێ هەڵگیرابوو، دەست پێدەکا. بەڵام "ئانا" بڕوای بەم کەشوهەوا نوێیە نییە و بە ترسەوە ئەو چەند شێعرە بڵاو دەکاتەوە:

تووشی سەرسوڕمانم دەکەی کاتێک دەڵێی لە بیرم دەبەنەوە

منیان سەدان جار لە بیر بردۆتەوە

سەدان جار لە گۆڕدا راکشاوم

خاتووخودای شێعر کوێر و گێژ،

وەک تۆوێک لە ژێر عەرزیدا رزام

کوا جارێکی تر وەک قەقنەس

لە ناخی خۆڵەمێشەوە رادەبێ و لە شەقەی باڵان دەدا

بەرەو ئامێزی شینایی‌یە رەسەنەکان.

بەڵام ئەو جار هەر بەراست ئیزنی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی دەدرێ. هەڵبژاردەیەک لە هۆنراوەکانی پێشووی لەساڵی ١٩٥٨ دا چاپ دەکرێ و پێشوازی‌یەکی یەکجار باش و بێ‌هاوتای لێ‌دەکرێ. بۆ جارێکی دی ئاخماتووا سەرنجی کۆبوونەوە ئەدەبی‌یەکان بۆ لای خۆی رادەکێشێ و شێعرەکانی وەبرەو دەکەوێ. ئەو لەو ساڵانەدا خەریکی نووسینی شێعرە بەرزەکەی خۆی بە ناوی "بێ‌قارەمان" دەبێ. ئەو شێعرە بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٦٢دا بڵاو دەکرێتەوە. ئاخماتووا لەو شێعرەدا کە دەکرێ بڵێین پوختترین و پڕ پێچوپەناترین کاریێتی، کەلێن و پەسیوە نیوە روون و نیوە تاریکەکانی چل ساڵ ژیانی خۆی دەخاتە بەرچاوی خوێنەران.

لە ساڵی ١٩٦٤دا ئاخماتووا سەفەرێک بۆ ئیتالیا دەکا تا خەلاتی "ئانتا – تائورمینا" کە خەلاتێکی بە ناوبانگی ئەدەبی‌یە، وەربگرێ. هەر لەو ساڵەشدا بە بانگێشتنی زانکۆی "ئاکسفۆرد" دەچێتە بەریتانیا و دوکتۆرای شانازی لە لایەن ئەو زانکۆیەوە وەردەگرێ.

ئانا ئاخماتووا بێ‌شک یەکێکە لە شوێندانەرترین هۆنەرانی شێعری مودێرنی رووسیا. کاریگەری ئەو لەسەر شاعێرانی پاش خۆی وەک "یەفتوشینکۆ"، "ئاندرێ وازنێسنێسکی" و "بلاخما دوولینا" حاشاهەڵنەگرە.

ئاخماتووا لە دوایین رۆژەکانی ساڵی ١٩٦٥ لە نەخۆشخانەیەکی نزیک مۆسکۆ دەخرێتە ژێر چاوەدێری و دەرمانەوە و لە ٥ی مارسی ١٩٦٦ لە تەمەنی ٧٧ ساڵاندا ماڵئاوایی لە ژیان و شێعر دەکا.

# سەر لێشێواوی

چ خنکێنەرە رووناکی
چەندە ئارام نیگاکانی دەشنێتە ناو هەناومەوە
چەندە ساکار ئەو پیاوە یەخسیرم دەکا
بەڵام ساتێک دادێتەوە
-بەر لەوەی وشەیەک بڵێ -
خوێن روخسارم بە جێ دێڵێ
داخۆ ئەوین دەبێتە کێڵی ژیانم؟

نارِوانیە من، خۆشت ناوێم
خودا نەتحەسێنێتەوە، چەندە جوانە روخساری تۆ و
من باڵەکانی منداڵیم لێ ون بووە
تا لە شەقەی باڵ بدەم و بفرِم.

تەمێک وەسەر چاوم دەکشێ

تا هەموو شت و هەموو روخسارێک

لێڵ ببینم

جگە لەو گوڵاڵە سوورەی

لە کونی دوگمەی کۆتەکەت داوە.

# نهێنی

وا ئێستە بەهار هات، پڕ لە ڕەنگ و میوە
چەندی خایاند چاوەڕوانیم
پازدە بەهاری پڕاوپڕ لە خۆشی
زەویم لە ئامێز وەرێنا و
قەت لێی جودا نەبوومەوە
تا پاییز نهێنی خەوتووی
لە گیانی مندا خوێندەوە.

# بەڵێ بۆ تۆ

بەڵێ بۆ تۆ؟
ئەوە شێت بووی؟
من تەنیا بەڵێ بۆ خودا دەڵێم.
ئیتر ئەم ژان و ئازارەم ناوێ
مێردەکەم زیندانەوانە و ماڵەکەشم بەندیخانە.

بەڵام ئەوە من بووم کە هاتمە شوێنت
لە ڕۆژێکی زستانیدا
کە باڕن هەموو پیدەشتی داگرتبوو.
زیندانەکەت چ ڕووناک بوو
ئەو بەری پەنجەرە بەڵام
چەندە تاریک.

ئێستە لە زستانێکی دیکەدا

باڵندە باڵ لە شووشەی هۆدەکەم دەسوێ و
خوێنێش پەڕ و باڵی سپی
ئەرخەوانی دادەگێڕێ

ئیتر ئارام و دڵخۆشم
سوپاس بۆ تۆ ئەی خۆشەویستی هەمیشەم
چون زیارەتگەرێکت رێ داوەتە ماڵەکەت.

# هەموو ڕۆژێ

هەموو ڕۆژێ، گشت بەیانێک
کە چاوەکان یەستا هەر یەخسیری خەون
لە گەڵ خۆم دەدوێم بە دەنگی بەرز
ئەویش وەک خوێن لە دەمارما
وەکوو هەڵمی هەناسەکان لە سینگمدا
وەکوو عەشقێکی بەختەوەرانە و
غەدرێکی چاوەڕوانکراو
لە لەشمدا
هەر چڵ دەدا.

# ئیتر لە لیوانێک ناخۆینەوە

ئیتر ئێمە بە لیوانێک ناخۆینەوە

نە قومە ئاوێک و نە چۆڕە شەڕابێک.

ئیتر ماچەکانی بەری بەیانانیش تەواو دەبن

چاو لێکردنی ئێوارنی خۆرنشین،

لە پشت پەنجەرەکانەوە.

ئەتۆ لە گەڵ خۆردا دەژی و

من لە گەڵ مانگ

بەڵام لە ناو هەردووکمان‌دا

تەنیا ئەوینێک زیندووە.

کە بۆمن هەڤاڵێکی وەفادار و شیرینە و

بۆ تۆ

کیژێکی خوێن شیرین.

بەڵام چاوی خۆڵەمێشیت

ترسێکیان تێدا دەبینرێ

تۆی بوویە هۆی نەخۆش بوونم.
دیدارەکان درەنگ و کەمخایەن
لە شیعرمدا هەر دەنگی تۆیە دەخوێنێ و
لە شیعرتدا رووحی منە هەڵوەدایە.
ئاورێکی وا داگیرساوە
نە فەرامۆشی و نە ترس پێی ناوێرن.
لەو کاتەدا بریا تۆ بتزانیبایە
چەند تامەزرۆی لێوی وشک و چێرەییتم.

## مەگەر

مەگەر من نەبووم لە پای خاچدا
مەگەر من نەبووم لە زەریادا خنکاو
خەفەت ناخۆم چون ئێستاکە
لێوەکانم تامی تۆیان بیر چۆتەوە.

# بیرەوەری

پێمان وابوو نەدار و دەست کورتین

بەڵام کاتێ لە کیس چوونی هەموو شتێ دەستی پێکرد

هەموو رۆژێکمان بوو بە بیرەوەری

ئەوسا شێعرمان هۆنیەوە

بۆ هەموو ئەوەی هەمان بوو

بۆ دلۆڤانی خوداوەند

## شەوکەران

دەڵێی لێرە

هەرگیز دەنگی مرۆڤ نایەتە گوێ

تەنیا بای سەدە بەردینەکان

دەرگا ڕەشەکان دەکوتن.

دەڵێی لێرە

لە ژێر ئەم ئاسمانەوە

تەنیا من زیندوو ماومەوە

چونکە هەوەڵ مرۆڤێک بووم

ئاواتەخوازی جامێکی شەوکەران بووم.

# بۆ شێعر

منت تا ئەو شوێنە بردووە، هیچ ڕێگەیەک نایگاتێ
به گۆ ئەستێرەیەکی ئاگرینەوە
تا نیشتمانی ڕەشی خەم
بۆ من ناهومێدی بووی
فریو بووی
بەڵام
سوکنایی
هەرگیز.

# چوارینەکان

*

ڕۆژەکانی سپی و بەتاڵی کریسمەس

کڕێوە و بەفر و بادەوە

بە من چی شەقامەکان خلیسکن

جێگەیەکم نیە بچم

*

هەمووان دەبەخشم و

لە پای خاچی مەسیحدا

ماچ دەکەم نێوچاوانی ئەوەی کە خەیانەتی کرد

لێوەکانی ئەوەی نەیکرد.

*

ڕەنگی زێڕ دەگۆڕێ،

مەڕمەڕ دەبێتە خاک

پۆڵا ژەنگ دێنێ

نەمان هاوڕێی هەموو شتێکە لە دونیادا

تەنیا خەمە خۆڕاگرە

تا ئەو کاتەی وشە بەشکۆ بمێننەوە.

# ئەو كاتەی كە تووڕەی

ئەو دەمەی قین برووسكەیدا و هەڵچوو
ئێمەش ئاواتی مردن و تێداچوونی یەكترمان خواست
رەنگە نەمانزانیبوو كە ئەم دونیایە
بۆ هەر دووكمان شوێنێكی یەكجار بچووكە.
نەشتەری تیژی یادەكان بێبەزەیی
دەترووشێنن
-ئەو جەللادە بێڕەحمانە-
پاشان لە جەنگەی شەوێكی پڕ لە ژاندا
بە گوێچكەتدا دەچرپێنن:
بۆ هەمیشە باری كردووە خۆشەویستەكەت!
ئینجا لە ناو دووكەڵی ئەو عوودەی وا دەسووتێ
بە شادمانی و بە درۆنگی و خۆرپەوە
تێت دەڕوانن
بەو چاوانەی كە ناكرێ لێیان دەرباز بی
ئیتر دڵت
هێور هێور تێكدەچرژێ.

# بیرەوەرییەک لە ناخم دایە

بیرەوەرییەک لە ناخم دایە
چەشنی بەردێکی سپی لە چاڵێکدا
مەبەستی بەرنگاربوونەوەیم نییە و
تاقەتیشی:
بۆ من شادییە و خەفەتیش.

ئەگەر بێتوو کەسێک بڕوانێتە چاوم
دەیبینێ.
خەمینتر دەبێ لەوەی کە
سەربوردەیەکی دڵتەزێنی بیستووە.

دەزانم خوداکان مرۆڤ دەکەنە شتێک
بێ ئەوەی رووحی لێبستێننەوە
تۆش بووی بە بەردێک لە ناخما
هەتا خەمەکان نەمر کەی.

# چ بکەم بڕستم لێ دەبڕێ

چ بکەم بڕستم لێدەبڕێ

ئەو دەمانەی کە لە لای من

ناوی بە سەر زاردا دێنن.

لە تەنیشت کۆلکەیەکی سووتاوەوە

لە توولە ڕێی نێو دارستانەوە تێدەپەڕم

بایەکی نەرم و ناوادە دەشنێتەوە،

سەرەڕۆ و بە بۆنی بەهارەوە...

دڵی منیش لە هەناویدا

هەواڵی دوورە دەستەکان دەبیستێ،

هەواڵی تاڵ

ئەو زیندووە،

پشوو دەدا،

بەڵام خەفەتێکی لە دڵدا نییە.

# دواهەمین پێک

دواهەمین پێک دەخۆمەوە
بە سڵامەتی ئەو یەکیەتی‌یەی لێکهەڵوەشا و
بۆ تەنیایی هەردوکمان و
خەفەتی من.

هەمیشە هەر دەخۆمەوە
بە سڵامەتی ئەو لێوانەی درۆیان کرد
ئەو چاوانەی سارد بوون وەک گۆڕ
دونیای توورە و بێبەزەیی و
ئەو فریاڕەسەی
لە غوڕابی خەودایە.

# بیانی

سێ بەهارە لە لینینگراد پەڕیوەم
سێهەمین؟ و ڕەنگە دواهەمین.
بەڵام هەرگیز لە بیر ناکەم
تا سەرەمەرگ
کە چلۆن زەمزەمەی ئاوم عاشقانە خۆشدەویست.
لە ژێر سێبەری دارەکان:
داری قۆخ گوڵی کردووە،
تۆزی وەنەوشەکانیش
لە هەوادا دەشنێتەوە.
کێ دەتوانێ بە من بڵێ
لە سەر خاکێکی بیانیم؟

# دارِمان

وەکوو عاشقێک بە چەنگەوە نەهاتووم
تا بچەمە ناخی خەڵکەوە
شێعرەکانم ترپە ترپی پێی گوڵێکە
بیانبیستی دەناڵێنی و
نەفرەت دەکەی.
وەهات بۆ لە تاڵی‌یەکان دەدوێم
کە لێم هەڵێی
هەرگیز نە ناوبانگم ویستووە و نە ستایش
سی ساڵی رەبەق ژیاوم
لە ژێر باڵی دارِماندا.

# ئاسمان ڕەنگی پەڕیوە

شووشەی سەهۆڵ لە ژێر پێیەکاندا دەشکێ

ئاسمان ڕەنگی بزرکاوە

لەبەرچی وا دەمڕەنجێنی

چیم لە تۆ کردووە نازانم؟

بمکووژە ئەگەر دەتهەوێ

بەڵام شەرم پێ مەفرۆشە

نە منداڵت لە من دەوێ

نە شێعرێکیش

چۆنت پێخۆشە وابکە

من سوورم لەسەر سوێندەکەم

ژیانی من هەر بۆ تۆیە-

بەڵام تا گۆڕ

ئەو خەمەم هەر لە دڵ دایە.

# چ تاریکن

چ تاریکن
باریکە ڕێی نێو دارەکان لە سەیرانگای قەراخ دەریا
چ زەرد و پڕ لە ڕووناکین
گڵۆپەکان
چ ئارامشێکم هەیە... من.
باسی ئەو لە لای من مەکە
وەرە و تەنیا هەر ئەمشۆکە
ناوی ئەو لە لام مەهێنە
تۆ دڵگری
ئێمە یەکترمان خۆش دەوێ
پێکەوە پیاسە دەکەین
یەکتر ماچ دەکەین و پیر دەبین
مانگە سووکباڵەکان بە سانایی و بە پەلە تێپەڕ دەبن
وەکوو ئەستێرە سپییەکانی
سەرسووڕمان.

# دەزانم تۆ خەڵاتێکی

دەزانم تۆ خەڵاتێکی

بۆ ساڵەکانی پڕ لە رەنج و مەینەتیم

بۆ ئەوەی هەرگیز دڵم نەدا بە چێژە خۆشە مادیيەکان

بۆ ئەوەی کە هەرگیز نەمکوت بە عاشقێک

کە تۆ تەنیا ئەوینمی

بۆ ئەوەی کە خراپەم دی و لێی بووردم

ئەتۆ دەبی

بە فریشتەی هەرمانی من.

# پانتایی سیحراوی

چەند جوانە ئێرە: کزەبایەکی سارد

بەفرێکی تورت، بەربەیانێک ساردتر لە دوێنێ

قاڵەوە بووی سوورە گوڵێک

لەسەر پنچکێکی داپۆشراو بە بەفر

پانتایی سیحراوی بەفر:

شوێن پێی دوو کەس

هەتاکوو چاو هەتەر دەکا

وەبیرهێنانەوەی هەنگاوەکانی من و تۆ

لە رۆژە دوورەکاندا.

# لێگەڕێ

لێگەڕێ با کات تێپەڕی،

شوێن تێپەڕی

هەموویانم لە رووناکی بەربەیاندا دیوە:

دواهەمین نێرگزی سەر میزەکەت

دووکەڵی کاڵی جگەرەکەت

ئەستێرەی ئارام و بێ کڵپە

لە ئاوێنەی گەورەی هۆدەکەی تۆدا

کە دەیهەوێ وێنەیەک لە تۆ بنوێنی...

تۆ ناتوانی یاریدەم دەی... چارە نییە.

بۆچی شێعرێکم نەنارد

لە لای دەریاوە بایەک دێ

ئەو ماڵەی کە ئیتر چۆڵە و

نسێی شۆخترین کاژیش

وا لەوبەری قاچاخترین پەنجەرەوە...

لەو جیهانەدا هەر تاقە کەسێک هەبوو

که دەمتوانی

هەموو شیعرەکانی خۆمی بۆ بنێرم

بەڵام بۆچی؟

لێگەڕێ لێوەکان بزەی تاڵیان بێتێ و

دڵی منیش جارێکی تر

با موچڕکێک داگیری کا.

# له شێعرەکانی تاشکەند

خەوتن بە لەشێکی شەکەت
عاشقانە لەخەو رابوون!
لە ناکاو زانینی ئەوەی مێلاقەکان چەندە سوورن
ئەو هێزە ئاسمانی‌یە چییە
کە دەخزێتە بورجی عاجی خاتووخودای خەمەکانت؟
حەوشە بچووکەکەت، جلە شۆڕاوەکانی سەر تەنافەکە
بەرامەیەکی شێتانە بە ژین دەبەخشێ.
سپی‌دارەکان حەسارن بۆ ئەو عەیشە بێ‌سنوورە
شەهرزاد
بە هەنگاوە وردیلەکانی لە باخەکە دێتە دەر
ئەتۆ ئاوای؛
رۆژهەڵاتی‌یەکی تەواو.

سەرچاوە:

١-آخماتوا،آنا(١٣٧٧) خاطرەای در درونم است، ترجمە احمد پوری، تهران: نشر چشمە

٢-آخماتوا، آنا (١٣٩١) آنا آخماتوا؛ شاعری در مسیر بادها، مجلە الكترونیكی سیمرغ

تیسویَتایوا دەڵێ: ئەگەر بەهەشتم بە مەرجی دەستداشتن لە نووسین بدەنێ، نامهەوێ". ئەوەی سەبارەت بەو شاعیرە سەرسووڕهێنەر دەنوێنێ ئەوەیە کە شان بە شانی حەول و تەقەللای بێبڕانەوەی بۆ گەشە بەخشین بە لێوەشاوەیی و هەڵکەوتەیی، بە درێژایی ژیانی بەرپرسایەتی قورسی ژنانەشی لە سەر شان بووە. هەر چەند لە سەردەمی قەیرانی تەمەنیدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی کەوتە تەنگانەوە، بەڵام ئەو ئەرکەی تا کۆتایی ژیانی هەر لە سەر شان بوو.

سەبارەت بە ژیانی مارینا ئەوەندەمان زانیاری لە بەر دەست دایە هەتا بە دیتنی وزەی شاراوەی لە رادە بەدەری هونەرەکەی سەرمان سووڕ بمێنێ. ئەو وەک منداڵی گەورەی پرۆفسۆرێکی هونەرە جوانەکانی زانکۆی مۆسکۆ، سەردەمی منداڵی خۆی لە کەشوهەوایەکی لێوانلێو لە دارایی و خۆشیدا رابوارد. بەڵام زۆری نەخایاند کە هێمنایەتی ماڵەکەیان تێکچوو. دایکی مارینا کە پیانۆ ژەنێکی کارامە بوو، بە هۆی گیرۆدە بوون بە نەخۆشی ئازارەباریکەوە، لەو جیهانە باری کرد. پاش مەرگی دایکی، مارینا پیانۆ ژەنین وەلا دەنێ و روو لە هونەری شێعر دەکا. ئەوەی لەو سەردەمەی ژیانی ماریناداجێی سەرنجە ئەوەیە کە؛ ئەو وەک دایکی گرینگییەکی ئەوتۆی بە لایەنی ماددی ژیان نەدا، ئەگەرچی ئەو لایەنە رۆڵێکی گرینگی لە ژیانی ساڵانی داهاتووی ئەودا هەبوو. ئەوە میراتی دایکی بوو کە بەو گەیشتبوو، هەر بۆیە بۆخۆشی سەبارەت بەو بابەتە دەڵێ: "پاش کۆچی دوایی دایکم تاقە رێیەک لە بەردەمم دا ماوە، ئەویش شاعیرێتییە".

هەژدە ساڵان بوو کە ناوبانگێکی بەرچاوی وەدەست هێنابوو. هەر لەو تەمەنە دایە کە کەسایەتی وەک "ماکسیمیلیان وولوشین" شاعیر و وێنەکێشی ناودار دێتە بازنەی هاوەڵانییەوە و دەبێتە یەکەمین لایەنگری ئەدەبی مارینا.

هەر لە ویلای وولوشین لە کریمە لە گەڵ "سێرگێئی ئێفرۆن" شاعیر و نووسەری حەڤدە ساڵان یەکتر دەناسن و پاشان پێکەوە ژیانی هاوبەش پێک دێنن.

مارینا لە گەڵ شاعیرانی سەردەمی خۆی وەک "ئۆسیپ ماندلشتایم" و "سوفیا پانۆک" پیوەندی گەرموگوڕی بووە. ئەو هەروەها هۆگرییەکی زۆری بە شێعری شاعیرانی وەک ئانا ئاخماتووا و ئەلکساندر بلووک هەبووە و تەنانەت بەشێکی زۆری شیعرەکانی بۆ وان نووسیوە.

ژیانی تیسوێتایوا پڕ کەندولەند و بەڵام پڕ لە بەرهەمی هونەریش بووە. ئەو هەر بە زوویی لە هاوسەرەکەی هەڵدەبڕێ. ئێفڕۆنی هاوسەری رەگەڵ ئەفسەرانی ئەرتەشی سپی دەکەوێ و مارینا و منداڵەکانی دەمێننەوە. مارینا لە لایەک خەریکی راپەڕاندنی کاروباری رۆژانەیە و لە لایەک خەریکی داهێنانی کاری هونەری و نوسینی شێعرە. هەر لەو بارەیەوە لە نامەیەکدا بۆ "بۆریس پاستێرناک" دەنووسێ: "هیچ دەرفەتێکم بۆ بیرکردنەوە و وردبوونەوە و رامان لە دیاردەکان نەماوە. شەو و رۆژ یەخسیری دەستی کاری رۆژانەم و زەین و مێشکم بە دەست ئەو کارانەوە پواوە. من هەر لە یادداشتەکانمدا خۆم دەبینمەوە و هەڵبەت لە پیاسە تاکەکەسییەکانیشمدا، کە

ئەویش زۆر دەگمەن هەڵدەکەوێ پیاسەیەک بکەم. لە تەواوی ژیانمدا منداڵم بە باوەشەوە بووە و نەحەساومەوە."

مارینـا تیسـوێتایوا هاوچـاخی ئاخمـاتوا، ماندلشـتایم و پاسـتێرناک، یەکێکە لەو چوار شاعیرە گەورەیەی روسیا، کە لە سەدەی بیستەمدا ژیاون. مارینا پێنج ساڵ دوای شۆڕشی سوور، وێڕای کچەکەی شورەوی بە جێ دێڵـێ، بـۆوەی رەگـەڵ مێردەکـەی کـەوێ، کـە چوبـووە ریـزی لایـەنگرانی ئەرتەشـی سـپییەوە. بـەو شـێوەیە پێـی نایـە هـەرێمی دوورخرانەوەیـەکی خۆویست. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی پێوەندی سروشتی خۆی لە گەڵ خوێنەرانی بپسێنێ.

"مەدمەک گوولین" ژنە شاعیری ئیرلەندی لە پێشـەکی کتێبی "شێعری ژنانی جیهاندا "دەنووسێ: من رێزێکی زۆر بۆ توانایی و هەڵکەوتەیی "ئیمیلی برۆنتـە" دادەنـێم، بـەڵام "تیسـوێتایوا" منی شـێت و شـەیدای خـۆی کـردووە. مارینا ژنێکە بە کچێکی جوانەمەرگ لە شەڕدا و کچێکی لە دەست قاتوقڕی خەلەسـاوەوە، بـە بـوێری و دلێرییـەکی زۆرەوە، لـە سـوچی مدبەقەکەیـەوە بەشـێکی زۆر لـە ئەدەبیات و نـەمری بۆ خـۆی داگیر دەکا. بریندار بوون و ژان چەشتن لە دەست شۆڕش و منداڵبوون، یان لە دەست هـەر دووکیـان و دیسـانیش هـەر بەجێنەهێشـتنی پێنـووس و بـەردەوام بـوون لـە سـەر شـێعر نووسین، پێویستی بە پشکووتنی رەسەنترین و راستەقینەترین بیر و زەینـی شاعیرانەوە هەیە.

سەرەنجام لە ساڵی ١٩٣٩دا لە گەڵ کوڕەکەی کە سەردەمێک بوو پەڕیوەی وڵاتان ببوون، دەگەڕێنەوە بۆ رووسیا. بەڵام وێڕای بنەماڵەکەی بە دژایەتی لە گەڵ رژێمی شووڕەوی تاوانبار دەکرێن. کوڕەکەی و مێردەکەی هەردوکیان دەستبەسەر دەکرێن و ئەویش لە ساڵی ١٩٤١دا خۆی هەڵدەواسێ و کۆتایی بە ژیانی دێنێ. ساڵەهای ساڵ پاش مەرگی ناو و ناوبانگی سەرەتا لە ئامریکا و دواتر لە نیشتمانی خۆیدا و پاشانیش لە وڵاتانی دیکەی جیهاندا رۆژ بە رۆژ پەرەی ستاند و لە ساڵی ٢٠٠٠دا وەک یەکێک لە دە مەزنە شاعیری سەدەی بیستەم ناودێر کرا.

# راستەقینە دەزانم

راستەقینە دەزانم من، ئەوی دی هەموو ئەفسانەن!
هیچ گەلێک لە هیچ کوێی زەوی پێویستی بە شەڕ نییە.
بڕوانن وا خۆرنشینە،
شەو خەریکە وردە وردە بە سەر دادێ:
چی شک دەبەن بیگێڕنەوە ئەی شاعیران،
هۆ عاشق و جەنگاوەران؟

ئێستاکە با ئارام دەبێ و خاکی خاو شەونم دەپۆشێ،
تۆفانی ئەستێرەکانیش لە ئاسماندا ئۆقرە دەگرێ و
بەو زووانە ئێمە وێکڕا لە ژێر خاکدا وچان دەدەین
ئێمە کە لە سەر ئەو هەرگیز
دەرفەتێکمان بۆ ئارامش نەدا بە یەک.

# قەت لە دۆزەخ رزگار نابین

لە دۆزەخ قەت رزگار نابین، خوشکە دەردەدارەکانم
ئێمە لە شیلە رەشەکان دەخۆینەوە-
ئێمە کە لەسترانمان‌دا خودامان ستایش دەکرد
بە تان‌وپۆی لەشمان،

ئێمە کە شەوەکانمان بە چەماوەیی لە سەر بێشکە
یا لە کاتی تەشی رستن‌دا رانەبواردووە،
ئێستا لە سەر گەمیەکی گێڕ
بە ناو ئاوەکان‌دا ویڵین
بە تویێ باڵتەیەکی بێ قۆڵەوە،

ئێمە کە بەری بەیانان جلکی حەریرمان دەپۆشی
ئێستا لە کوێ
سترانی خودایی بڵێین؟
:
لە لای ئاگری خێوەتی چەتەکان!

(لای)ژنانی جلک درووی هەرزەش

(ریسەکەمان بۆوە خوری)

سەماکەر و ئەکتەرە هەڵە و هەرزەکانیش:

ئێمە کە شاژنی تەواوی جیهان بووین!

سەرەتا بە جلکی شڕ و دڕ داپۆشراو

پاشان بە تاجێکی پڕشنگدار لە سەر بسکەکانمانەوە

لە بەندیخانە و لە جەژنەکاندا

ئێمە بەهەشتمان لە کیس چووە

لە هەمبەر نیوە شەوە پڕ ئەستێرەکان و

باخە سێوە بەهەشتی‌یەکان.

خوشکە بەڕێزەکانی من، ئەی کیژۆڵە نەجیبەکان

بێ‌شک خۆمان لە دۆزەخدا دەبینینەوە.

# سێ شێعر بۆ ئانا ئاخماتوا

## خاتووخودای سەردوولکە(١)

ئەی خاتووخودای سەردوولکە؛"١"
تۆ لە نێو خاتووخواکاندا جوانترینی
پڕشەنگدانەوەی شێتانەی شەوی سپی:
تۆ لە هەموو خاکی رووسیا،
تۆفانێکت لە بەفری رەش هەڵکردووە و
گیانمان بریندارى نێزەی گورچووبڕی سەردوولکەکانی ئەتۆیە.

ئاوەهایە کە ئێمە وەک (ئەسپی لە مێخ یاخی) لغاو دەپسێنین و
چیها بەڵێنمان لە گەڵ بەستی – ئاخ!ئانا"٢"
ئاخماتووا- ئەو ناوەی وەک ئاخێکی قووڵ
رۆدەچێتە قووڵاییە نەناسراوەکان.

ئێمەش هەڵبژاردەکانین چونکوو هەنگاو هەڵدەگرین
هەر کەس لە سەر ئەو زەوییەی
تۆ هەنگاوت لە سەر هەڵێناوە؛
لە ژێر ئاسمانێکی هاوبەشدا

هەر کەس لەگەڵ توانایی مەرگهێنی تۆدا هاودەردە،

نەمر دەژی

لە ئەو پەڕی مەرگی خۆیدا.

لە شاری خۆشئاوازی مندا،

گومبەزەکان بە جوانی دەدرەوشێن

هەڵوەدای کوێر؛ خوای پڕ تیرێژی ئێمە ستایش دەکا.

من شارەکەم

بە ژامە بێ ئەژمارەکانییەوە پێشکەشی تۆ دەکەم

ئاخماتووا؛ وێڕای ئەویش: دڵم.

١– خاتووخودا هاوسەنگی وشەی (Muse) ە؛ ئاماژەیە بۆ خاتوو خودای هونەر لە یوونانی کەوناردا.

٢– ئاخ لە رووسیش دا (Akh) ە و بەشی یەکەمی ناوی شاعیری مەبەستی تێسوێ تایواشە.

## "خاتووخودای شیعر"(٢)

راوەستاوم، سەرم لە ناو دەستەکانما، بیر دەکەمەوە
چ بێ بایەخن ئەو داوانەی بۆ یەکی دەنێینەوە
سەرم لە ناو دەستەکانما و سترانت بۆ دەخوێنم
لە دوایین ساتەکانی خۆرنشینەوە تا سپێدە.

ئاخ چ بەهێزە ئەو شەپۆلەی
کە منی کێشاوەتە سەر ترۆپکی خۆی
سترانی ستایشی ئەو کەسەی بێهاوتایە لە ناومان‌دا
هەر وەکوو مانگ کە تەنیایە لە ئاسمان‌دا.

ئەو کەسەی وەکوو سێرووبەک
روو بە ئاسمانی دڵم هەڵدەفڕێ
سینگی هەورەکان هەڵدەدڕێ
بە دندوکێکی هەڵۆیی و بە تووڕەیی مەرگاوییەوە:
تەنانەت میهرەبانی تۆش، مەترسی هەڵیدەگرێ.

چونکە شەوی بەرینی دەروونی خۆت ڕاخستووە
لە سەر زێڕی بێخەوشی کڕێملین
گەروشم بە چێژی ئاواز دەگوشی
هەر وەک بە گوریسێکی ئەستوور...

بەڵێ دڵخۆشم من، قەت سپێدە ئاوا گەش دەرنەکەوتووە
درەوشاوەتر و ڕووناکتر لە ئێستای،
دڵخۆشم من، لە پێشکەش کردنی هەموو شتێک بە تۆ و
دوورکەوتنەوە وەکوو هەژارێکی داماو
چونکە من هەوەڵ کەس بووم کە پێشکەش تۆم کرد
ناوی خاتووخوای شیعری "تزارسکۆسلۆ"(١)
ئەی ئەو ژنەی، کە دەنگی تۆ
وەکوو تاریکایی‌یەکی قووڵ
ڕێی بە هەناسەم گرتووە!

١- ئاخماتووا زۆربەی ساڵەکانی لاوەتی لە شاری میرنشینی تزارسکۆسلۆ، نزیک شاری پێترزبۆرگ بردە سەر و هەر بەو هۆیەش جارناجارێ سەردانێکی ئەوێی دەکرد.

# خۆر لە دەستەکانی تۆدا (٣)

تۆ هەموو شتێکت گرتۆتە دەست،

تەنانەت خۆریش

لە دوورە دەست و لە مستتدا ئەستێرەکان رێکدەکوشی!

بریا بمتوانیبا لە دەرکێکی ئاوەڵاوە وەک شیبا

بشناباماەوە بە رووی تۆدا،

قسەشم کردبا بەزمانێکی پسک،

بە روخسارێکی داگیرساو لە شەرمەوە

بمتوانیبا سەرم داخەم لە رووی تۆدا و

فرمێسکەکان داوەرێنم وەک منداڵێکی گرینۆک

بۆ گەیشتن بە لێخۆش بوون.

# چوار شێعر بۆ ئەلیکساندر بلووک

## "ناو"(١)

ناوت باڵندەیەکە لە دەستما
لەتێک سەهۆڵ لە سەر زمان
وەک بزووتنی لێوەکان بۆ ماچ
ناوی تۆ پێنج نیشانەیە.
تۆپێکە لە بەرزاییەوە دەکەوێتە ناو دەستەوە
تامی گەڵای داری لەعلە لە ناو دەمدا.

ناوت زایەڵەی بەردێکە لە ئەستیرێکی مەنددا
ئەو دەنگەیە لوول دەخوا لە زەنازەنای سمکۆڵی تاریکیدا
بەرز وەک هەورە تریشقە
کە راستەوخۆ روو دەکاتە تەوێڵی من
توند و تیژ هەر وەکوو دەنگی پەلەپیتکە.

ناوت ماچیکی زۆر دوورە
لەسەر رەشایی چاوەکان، تەڕ و گەش

لە پەنا پێلوو گەلێکی کراوەی بێجووڵە

ناوت ماچی کلوو بەفرێکە

چۆڕیکی فێنکی جۆبارێکی بەهاری،

شین هەر بە چەشنی کۆترێک

نزیکترین وشە لە ناوی تۆ "خەوە.

# "گوێت لێدەگرم"(٢)

لە خاکی وەتەن لە مۆسکۆ-
ئەو شوێنەی کە گومبەزەکان دەدرەوشێنەوە*
لە خاکی وەتەن لە مۆسکۆ
–لە زەنازەنای دەنگی ژامەکاندا
لەو شوینەی من تێیدا دەژیم –
قەبرەکان بەڕیز لە تەنیشت یەک هەڵکەوتوون
لە ناویاندا قەیسەر و ژنەکانیان راکشاو.

تۆش نازانی کە چلۆن بەرەبەیان – ئەوە تەنیا کرێملینە
لە سەراسەری گۆی زەویدا هەوایەکی هەیە بۆ هەڵمژین.
تۆش نازانی چلۆن هەموو بەربەیانێک لە کرێملین
دووعات بۆ دەکەم هەتا کازیوەی رۆژێکی تر،

وێڕای تۆ هەنگاو هەڵدەگرم
– هەتاکوو قەراخ چۆمی نوای خۆت**
چۆمی مۆسکۆش – لەو لای ترمەوە خورەی دێ
راوەستاوم ئێستا لێرە، شەلالی خەیاڵ،

بە سەری شۆڕەوە و

ریزی چرای شەقامەکانیش دەبریسکێتەوە لە ئاوی چاوما.

خۆشم دەوێ

بە قەت هەموو ئەو شەوانەی هەتا سپێدە بێخەوم و

گوێت لێدەگرم

سەراسەری ئەو شەوانەی کە تا بەیانی ناخەوم.

تا ئەو ساتەی لە سەراسەری کرێملین

ئەو پیاوانەی کە ژامەکان وەدەنگ دێنن

– لە خەو رادەبن و چاویان هەڵدێنن.

سەرەڕای ئەوەش رووباری من و – رووباری تۆ

وێڕای ئەوەش دەستی من و دەستەکانت

هەرگیز ناگەنە یەکتری – تا ئەو ساتەی

سپێدەیەک دەگاتە سپێدەیەکی دی.

---

*دوو دێڕی یەکەم و بەشی کۆتایی ئەو شیعرە، ئاماژەیەکە بەو پاڕانەوە و دووعایانەی لە کلیسای ئۆرتۆدۆکس‌دا باون.

**چۆمی نوا: شاری شوێنەزای بلووک: سەنت پیترزبوورگ بوو.

## "لە ئامێزی مەرگدا"(٣)

پێیان وابوو کە مرۆڤە
جا بڕیاریان دا بیکوژن.
ئێستا کە ئەو مردووە،
تا هەتایە بگرین و شیوەن بگێڕن بۆ فریشتەیەکی مردوو.

لە دەمەدەمی خۆرنشیندا،
ئەو سترانی جوانی چڕی
ئێستە تیشکی گڕی سێ مۆم
بە لەرینەوەی وەهماوییەوە،

تیشکی گەرمیش لەو پەڕی کولووی بەفرەوە
لەوەوە سەرچاوە دەگرن.
سێ مۆمی داگیرساو
روو بە هەتاو،

وەکوو چەپەری رووناکی.

ئاخ، بڕوانە پێلوەکانی
چۆن دەوەرن،
ئاخ، بڕوانە باڵەکانی
چلۆن دەشکێن.

شینگێڕی رەشپۆش دەنگی هەڵدەبڕێ
فاتیحاخوێنەکان بێخەم، رادەبرن
شاعیر ئۆقرەی گرتووە لە ئامێزی مەرگدا و
هەستانەوە و راسانی خۆی کردۆتە جەژن و هەڵپەڕین.

## "میرات"(٤)

بڕوانە ئەوێ، ئەوە ئەوە، وەڕەز و ماندوو لە وڵاتانی بێگانە
ڕێبەرێک بێ پارێزەری تاکەکەسی.

لەوێ، ئەوە ئەوە،
کە جۆباری کوێستان لە دەستەکانیدا دەنۆشێ
شازادەیەک بێ وڵاتی دایی و بابی.

لەوێ لە هەرێمی پیرۆزی خۆیدا، ئەو خاوەنی هەموو شتێکە
بە سوپا و نان و دایکەوە.

میراتەکانی تۆ جوانن
حوکمات بکە ئەی هەڤاڵ، بە دوور لە هەڤاڵەکانت.

# سەراپا گوێم

سەراپا گوێم بۆ بیستنت
زیت و وریا وەکوو دایکێک کە لە خەودا
لە ژێر سەری ساوای نەخۆش دەم بە چپە
هەر ئەو جۆرەی لە باوەشی تۆ دام من، تا سپێدە.

خوێنم لە ژێر پێستەوە بانگ دەکاتە دڵی تۆ و
لە ئاسۆیەکەوە تا ئاسۆکەی تری ئاسمانم
دەربەدەری دیتنەوەی دوورگەی ئەوینن و
بەرەو تۆ دەخوشێن
رووبارەکانم.

من دەتارێم بەرەو لێژێک
وەک ئەو پلیکانەی دەگاتە باخێک
بە دوور لەو تابلۆیەی مەوداکان نیشان دەدا.

ئەستێرەکان شێتی زەوی و

لە سەر کێڵەکان،

ئەو شانازییانەی بە رەنجەڕۆیی دەست کەوتوون،

شێتی شەکانەوەی ئاڵا

لەوێ، کوندێک لە حەسرەت کاولاشەکاندا.

منیش بە هەڵەداوان رووە و خوار

دەچەمێمەوە بە رووتدا، وەک چەمانەوە بە سەر کێڵێکدا و

رابردووی خۆشم دەنێژم

بە لێوەکانم دەگەڕێم بە شوێن لێوەکانی تۆدا

وەک کانییەکی هەڵقوڵیو.

# ئەو کاتانەی دەڕوانمە هەڵفڕینی گەڵاکان

ئەو کاتانەی دەڕوانمە هەڵفڕینی گەڵاکان و
رچەی کەوتنیان تا ئاستی عەرزی
دەیان بینم کە-با- وایان رادەماڵێ
دەڵیی هونەرمەندێکی لێهاتووی شێوەکارە
کە سەرەنجام رەسمەکەی تەواو کردووە،
ئەو دەمە بیر دەکەمەوە:
[لەو کاتەشدا هیچ رێبوارێک پێی خۆش نییە
بڕوانێتە شێوەی راوەستانی ئەمن و
روخساری پڕ لە ئەندێشەم]
چون گەڵایەکی زەرد و وشکهەڵاتوو
بە جێماوە
بە سەر لقێکی دوورە دەستەوە.

# یەکێک لە باپیرەکانم

یەکێک لە باپیرەکانم ویۆڵۆن ژەنێک بوو
هەروەها ڕێگریش...
ئاخۆ ئەوە پاساوێکە بۆ سروشتی سەرگەردانم و
بۆ بۆنی بسکم کە بە دەم شەماڵەوە دەشەکێ؟

قژ ڕەش و لووت لە چەشنی دندووکی هەڵۆ، هەر خۆیەتی
کە قەیسی لە داشقە دەدزێ،
بە دەستەکانی من! بەڵێ ڕاست خۆیەتی
چارەنووسی من دەئاژوێ.

سەرقاڵی تەماشای ئارەق ڕشتنی ورزێڕە،
بە ڕوانینی پڕ ستایش
دایمە گوڵێکی نەستەرەن لە لێوەکانیا دەگەڕا
هەواڵێکی نالەبار بوو
ئەویندارێکی ڕەسەنیش بەڵام.
زۆری قەننەکەی خۆش دەویست،

مانگی نیوە شەوان و تەسبێحەکەشی
هەروەها هەموو ئافرەتە جوانەکانی جیرانی...
من پێم وایە خوێڕیش بووە
باپیرە چاو کاڵەکەی من.

دەترسا لە پیاسەی نیوەشەوانی ناو گۆڕستان
چون رووحی خۆی فرۆشتبوو بە شاییەک و
بێشک بەردەوام خەنجەرێکی پێبوو
شاراوە لە چەکمەکەیدا.
زۆر جار سیپەی دەگرت لە پەنا و پەسیوان
وەک پشیلەیەکی بریقەدار
من جاری وایە دڕدۆنگم لەوەی
کە ئاخۆ بە راستی دەیزانی ویۆلۆن بژەنێ؟

بەڵام دڵنیام کە لای ئەو
هیچ شتێک لە بەفری تواوەی پار بە بایختر نییە.

بەڵێ ئاوەها بوو باپیرە گەورەی خاوەن شکۆی من
ئاوەهاشە ژنە شاعیرێک کە منم.

# دڵخۆشم لەوەی ڕەنجی تۆ

دڵخۆشم لەوەی ڕەنجی تۆ بۆ من نییە و
ڕەنجی منیش بۆ تۆ نییە
زۆر شادیشم لە زانینی ئەو ڕاستییە.
کە عەردی ڕەق، هەرگیز لە ژێر پێمان ناخزێ و
دەتوانین ئاسوودە بژین لە پەنای یەک،
بە بێ ترسی چاوەدێری وشەی یەک و
بە بێ خۆفی، خنکان لەو شەپۆلە سوورەی
تا بنان گوێمان هەڵدەستێ
ئەو کاتەی کە قۆڵی کراسەکانمان لێکدەخشێ.

دڵخۆشم لەوەی بە ئارامشەوە دەڕوانمە تۆ
ئەو دەمەی وا لە بەر چاوم ژنێکی تر دەگرییە ئامێز
بە بێ ئەوەی بتهەوێ خەفەتبارم کەی،
هەروا کە تۆ ئاور ناگری
ئەو کاتانەی ئەمن پیاوێکی دیکە ماچ دەکەم.
دەزانم قەت، نە شەو، نە ڕۆژ

ناو و رووحم ئەویندارانە بانگ ناکەی
هیچ دەنگێکیش لە بێدەنگی زاڵی ناو کلیسادا
سترانی پیرۆزی پاک بوونەوەمان بۆ ناچڕێ.

سوپاس بۆ تۆ و بۆ خۆشەویستی بێدرۆت
چونکە تۆ هەست بە عەشق دەکەی،
ئەگەرچی هێشتا نایناسی.
سوپاس بۆ تۆ و ئەو شەوانەی کە من تێیدا
بە هێمنی و ئارامی‌یەوە رامبوارد
سوپاس بۆ تۆ و پیاسەکانی ژێر پرشەنگی مانگە شەو
تۆ دەستت لە من هەڵگرت و لە ژووانەکانی نیوە شەو،
کە قەت دووپات ناکرێنەوە.

سوپاس بۆ تۆ،
هەتاو هەرگیز دەستی پیرۆزی بە سەرمان داناهێنێ
سوپاسە خەمینەکانی
دڵی شێواوم وەرگرە
چونکە
نە رەنجی تۆ لە بەر منە و
نە رەنجی منیش لە بەر تۆ.

# سەر هەڵدێنی

سەر هەڵدێنی و لووتت بەرزە چونکە
لە خۆبایی و قسە زلی.
زستانی ئەو ساڵ
هەڤاڵێکی سەرەڕۆی بە دیاری بۆ من هێناوە!

من بە دەنگی خرینگە خرینگی بازنەکانم و
تۆش بە دەم مژ لێدانی هێور لە جگەرەکەت
لە شاری شوێنەزای منداڵ پیاسە دەکەین و دەگەڕێین
وەک گەڕۆکە بیانییەکان!

منیش ئەی پیاوی جوانی شۆڕە لاو!
قەت لێت ناپرسم: دەستی دلۆڤانی چەند ژن
برژۆڵە درێژەکانتی لاواندۆتەوە و
لێوە تینوەکانی چەند ژن لێوەکانتی ڕامووسیوە.

خۆشەویستی بە تینی تۆ

ئەو کەڵکەڵانەی بە تێکڕا بەزاندووە.

ئێستا دەتوانم شانازیت پێوە بکەم، ئەی پیرۆزە بچووکەکەم

هۆ کوڕە ساکارە دە ساڵانەکە!

لێگەڕێ تاوێک لە رۆخ رووبار راوەستین

کە لە ئاوەکانیدا

تەسبێحی دەنک زێڕینی چراکانی شەقام دەشواتەوە:

ئینجا هەتا دوورە دەستەکانت دەبەم:

تا گۆڕەپانێک

کە نیشاندەری حوزووری قەیسەرە مێر منداڵەکانە.

رێگە دەبڕی بە دەم فیتوو لێدانەوە،

وەک مێرمنداڵێکی کاڵی بێخەم

بەڵام دڵت لە مستتدا

ئەی ئەوینە سنوور بەزێنەکەم!

ئێستا بڕۆ

تۆ ئازادی

خودا ئاگادارت بێ.

# گەڵاش تامی شەو دەدا لە دەممدا

کاتی شەوە لە شارە گەورەکەی من
ماڵە خەوتووەکەم جێ دێڵم
خەڵکیش ڕەنگە ئەمن بە کیژێکی عازەب
یان بە ژنێک بزانن
بەڵام بیرێک لە زەینی مندا ناگەڕێ، جگە لە شەو

شنەی هاوین ئێستاکە ڕێگەم بۆ دەکاتەوە
لە پەنجەرەیەکی دوورەوە دەنگی مووسیقا دێ
دەڵێی هەتاکوو سپێدە دەشنێتەوە ئەو شیبایە
لە دەروونی تەنگ و نووتەکی سینگمدا.

چنارە ڕەشەکان، پەنجەرەکان، لێوڕێژی نوور.
دەنگی مووسیقا لە باڵەخانە بەرزەکانەوە و
چڵە گوڵێک بە دەستەوە.
بڕوانە هەنگاوەکانم هاوڕێیی هیچ کەسێک ناکەن

بڕوانە سێبەرەکەی من-هیچ شتێکی لە من ناچێ.

چراکان لە دەنکە تەسبێحی زێڕین دەچن
گەڵاش تامی شەو دەدا لە دەمما.
رزگارم کەن لە سنوورەکانی رۆژ،
هەڤاڵانم! بڕوا بکەن: من هیچ نیم
جگە لە خولیایەکی رازاوە لە زەینی ئێوەدا.

# ئەی شەو! بمکە بە تۆزێک خۆڵەمێش

ڕەش وەک ڕەشایی گلێنە
کە ڕووناکایی هەڵدەمژێ، خۆشم دەوێ وریایی و چالاکیت!
ئەی شەو! یەکەم دایکی هەموو ئاوازەکان!
دەنگێکم پێ ببەخشە با مەقامەکەت بخوێنم
لغاوی هەموو-بای دونیا لەوێ دایە:
لە ناو قامکەکانی تۆ دا.

ئەو کاتەی بە دەم هەراوە،
وشەی پڕ لە ستایشت پێشکەش دەکەم،
ئەمن هیچ نیم
جگە لە گوێچکە ماسی‌یەک
کە ئێستاش زایەڵەی ئوقیانووس لە ناخی‌دا
دەنگ دەداتەوە.

بەڵام من ماوەیەکی زۆر لە چاوەکانی مرۆڤم ڕوانیوە
ئێستا ئەی خۆری مەیلە و ڕەش،
ئەی شەو! بمکە بە تۆزێک خۆڵەمێش.

# پەنجەرەیەکی ڕووناک

پەنجەرەیەکی تر

بە شەونخوونی کێشانی ترەوە!

ڕەنگە ئەوان شەڕاب بخۆنەوە

ڕەنگە هەر دانیشتبێتن

یان ڕەنگە دوو دڵدار بن کە ناتوانن دەست لە یەک بەردەن.

هەر ماڵەی پەنجەرەیەکی ئاوای هەیە.

پەنجەرەیەک لە شەودا: لێوڕێژ لە زایەڵەی ژوان یان لێکدابڕان

ڕەنگە ڕووناک داگەڕابێ بە نووری شەوچراکان

یان تەنیا ڕوون بێ بە نووری لەرزۆکی مۆمەکان.

بەڵام لە هیچ کوێ بیری ناحەسێتەوە،

چونکە لە ماڵی منیشدا

ئەو خۆزگانە ڕووحیان وەبەر دێ.

ئارەزووی ماڵێکی زیندوو

شان بە شانی یارەوە و پەنجەرەیەکی ڕووناک.

## لە شەونخوونییەکان

هەر بەو شێوەی خۆشم دەوێ
ماچکردنی دەستەکان و
ناو بردنی هەرچی هەیە،
خۆشیشم دەوێ
کردنەوەی دەرگاکان!
ئاوەڵا لە سەر گازی پشت و
بە رووی تاریکایی شەودا!

تەوێڵ لە تاریکی دەسووم
هەر بەو جۆرەی گوێ دەدەمە
ئەو هەنگاوە بەرزانەی وردە وردە دوور دەکەونەوە
یان (گوێ بۆ با رادەدێرم)
کە رادەژێنێ
ئەو دارانەی وا خەوتوون

یان شەونخوونی دەکێشن.

ئاخ، شەو

رووبارە بچووکەکانی ئاو دەخوشێن و

سەر دەخەنە سەر سینگی خەو

(پیلوەکانم قورس دەبن)

لە جێگەیەک لە شەودا

کەسێک خەریکە دەخنکێ.

*بەشی ١ و ٤ لە دەقی ئینگلیزی و بەشی نۆش لە دەقی کوردیدا دەرهاوێژراون.

# نەشتەر لە دەمارم دەدەم

نەشتەر لە دەمارم دەدەم
ژیان
هەڵدەقوڵێ
بەردەوام و
ناچار
هەموو ئەو جام و پیاڵانەی
ریزم کردوون
لێورێژ دەکا و
ئەوسا
دەرژێتە سەر تەوێڵی
خاکی رەش
هەتا بەردەوام و ناچار
هەڵقوڵێ و
فوارە بکا
کانی شێعر...

# خەڵات

هەور گەلێکی بێژومار--لە دەوروبەری ئێمە
گومبەز گەلێکی بێژومار– لە دەوروبەرمان
سەرتاسەری رووسیاش
پێویستی بە دەستی لە رادە بەدەرە!
وەک نەمامێک هەڵتدەگرم
یەکجار بارسووکم بە تۆوە.

لەو باژێڕە سەیرەدا
لەو باژێڕە هێورەدا
هەروا سەرخۆش دەمێنمەوە
تەنانەت پاش مردنیشم.
تۆ دەبییە میراتگری تاج و تەختی من
یان رەنگە میراتگری ژان و رۆژە رەشییەکان.
چونکە تۆ نۆبەرەی منی!
رەچاو بکە ئاکار و رێ و رەسمە ئایینییەکان

لە قووڵایی دڵتەوە و

شانازی بە مۆسکۆ بکە، بە شاری کلیساکان-

بە پێیان رابرە بە سەرانسەری ئەو حەوت تەپکە بێ پەرژینەدا

بە هەنگاوە بەرز و بوێرەکانتەوە.

نۆرەی تۆش دێ

تۆش مۆسکۆ دەکەیە خەڵاتی کچەکەت

بە نارەزایەتییەکی خۆشەویستانەوە.

هەر وەکوو ئەوێیان بە من بەخشی

ئەوانەی بۆ هەمیشە لە گۆڕستانی (واگانوکوو)دا رازان

ئەو هەمیشە خەوتوانەی گۆڕستانی(واگانوکوو)

لە گەڵ دەنگی ژامی کلیساکان

لە کازیوەی رۆژی وادە دا.

---

*تیسوێتایوا ئەو شێعرەی بۆ ئالیای کچی گوتووە. ئالیا دوو مانگ پاش گەڕانەوەی دایکی بۆ رووسیا راپێچی بەندیخانە دەکرێ و ماوەی ١٧ساڵ لە ئۆردووگای کاری زۆرە ملی زیندانی دەبێ.

**لێرەدا مەبەست رۆژووی چللە و خۆپاراستن لە رەنگکردنەوەی برۆیە.

***واگانوکوو گۆڕستانێکی بە ناوبانگی مۆسکۆیە کە دایک و باوکی تیسوێتایوا لەوێ نێژراون.

# پیری پیرۆز

جوان و غەریب، ئەی براله شۆخەکه لیمی وەرگره
ئەو شاره، که دەستکردی هیچ دەستێک نییه!

کلیسا به کلیسا گومبەزەکانی و
ئەو کۆتره باریکانەش که له سەریانەوه هەڵدەفڕن.

لێم وەرگره (سپاسکیگەیت**) به گوڵەکانییەوه
ئەو شوێنەی ئۆرتۆدۆکسەکان کڵاو له سەر لادەبەن و

میحڕابی ئەستێرەکانیش که داڵدەی ئەهریمەنه
به عەرزەکەیەوه که بەماچ وه بریقه کەوتووه

پیری پیرۆز و تاقانه! ئەی هەواڵی پیرۆز لێم وەرگره
گومبەزه پێنجینەکەی کلیسای گشتی.
وەک میوانی هەرێمێکی دیکه
دەتبەم بۆ زیارەتی میحڕابی کلیسای(ئینا دۆرتێنت جووی***)

ئەو جێگایەی گومبەزە درەوشاوە زێڕینەکان

لەبەر تۆ دەدرەوشێنەوە و

ژامە هێدییەکان دیسانەوە وەک هەور دەگرمێنن،

لەوێ مەریەمی پیرۆز چارۆکەکەی بە سەر شانی تۆ دادەدا

لە سەر هەورە ئەرخەوانییەکانەوە

تۆش لێوڕێژ لە هێزە ئەفسانەییەکان، رادەبی و

ئیتر لە مەودوا قەت پەژیوان نابییەوە

لەوەی منت خۆشویستووە.

---

*ئەم غەزەلە بۆ ماندلشتایم نووسراوە کە خۆی لە سەنتپێترزبۆرگ دەژیا و تیسویتایوا مۆسکۆی زێدی پێشکەش دەکا.

**پێنج کلیسای گشتی لە کرێملین

***پەیکەرەیەکی سەرسووڕهێنەری مەریەمی عەزرایە کە لە نزیک کرێملین هەڵکەوتووە.

# مۆسکۆ

ماڵەکەی تۆ

چ میوانخانەیەکی مەزنە مۆسکۆ!

هەموو گەلی رووسیا بێخانولان بوون،

هەموو ئێمەش دەبێ پەنا بێنینە بەر تۆ.

بە داخی پڕ لە شوورەیی بە پشتمانەوە و

چونکە تۆ خۆت بەرەو لای خۆتمان بانگ دەکەی

هەرچەندە زۆری لێ دوورین،

چون مەڵحەمی داغەکان و

دەوای دەردەکانی ئێمە

لێرەیە،

لە "چایلد پانتلیموون"*

لە پشت دەرگایەکی بچووکەوە،

لەو شوێنەی حەشیمەت پوورە دەدەن

وێنەی"ئیورسکی"**هەڵواسراو-
سوور و زێڕین و پرشەنگدار.

سێڵاوی بەزەیی خودا
بە پێدەشتە گەرمەکان وەر بووە
دەچەمێمەوە و ماچ دەکەم
سینگی درەوشاوەت شارەکەی خۆم، مۆسکۆ!

---

*ئەو پیرۆزەی کە کلیسای ئۆرتۆدۆکس ستایشتی دەکا و بە بڕوای خەڵکی رەشۆکی شفای نەخۆشان دەدا.

**پەیکەرەیەکی مەریەمی عەزرایە کە شوێنی ستایشت و میحرابی تایبەتی بۆ چێکراوە و لە ساڵی ١٨١٢دا بۆ شاری ولادیمیر راگوێزرا.

# شار

لە سەر ئەو شارەی کە پیترۆی مەزن خستییە پشت گوێ
گرمەی ژامەکان دەنگ دەدەنەوە.
شەپۆلێکی پڕ خرۆش پاشەکشە دەکا ئێستا
لە بەرانبەر ئەو ژنەدا کە تۆ دەیخەیە پشت گوێ

ستایشتی ئەتۆ و پیترۆی مەزن دەکەم
هەرچەند ژامەکان لە هەردووکتان راوەستاوتر دەبن و

هەر گرمەیان لە ئاسمانی شیندا دەنگ دەداتەوە
هیچ گومانێک لە گەورەیی مۆسکۆ ناکرێ
چون یەکە یەکەی گومبەزی کلیساکان
قاقایان دێ بە لووت بەرزی قەیسەرەکان.

---

*پیترۆی مەزن(١٦٨٩-١٧٢٥)بناخەدانەری پیترزبۆرگە و بە جێی مۆسکۆ ئەو شارەی کردە پێتەختی رووسیا.

# هاوارێکی دوور و درێژ و بێوچان

له وڵاتی قووەکانەوە

کارگی بچووک، بۆلتووسی *سپی، دڵخوازم

سەمای مەزرا و سرووودی رووسیا

بە سەریدا دەنگ دەداتەوە،

فریام کەون توانای راوەستانم نییە

رەنگی خوێن بەرچاوی گرتووم

:

لەو بەرەوە دەمەکان ئاوەڵا

جۆگەلەی باریکی خوێن لە گۆشەی دەمەکانەوە چۆڕاوە و

هەر بریندارە ناڵەیەکی لێوە دێ:

-ئاخ دایە گیان!

:

ئەوان هەموویان وەک یەکن

بە بێ هیچ جیاوازییەک،

هەموویان هاتوون بە شەڕ بێن

بەڵام کامیان سەر بە باڵی منن؟

کامیان لە باڵی دژ بە من؟

:

ئەم پیاوە هی ئەرتەشی سپی بوو

ئێستا چۆتە پاڵ ریزەکانی "سوور"ەوە

خوێنی رژاوی "سوور"ی کردووە

ئەوەیان سەر بە ئەرتەشی "سوور" بوو

ئێستا لە گەڵ سپی‌یەکانە

مەرگ سپیایی خۆی پێ‌بەخشیبوو.

بەم شێوەیە لە راست و چەپ

لە پاش و پێش

لە سپی و سوور، هەر هاوارێک دەبیستری

ئاخ دایە گیان!

بێ دالدە و بە بێ تووڕەیی

هاوارێکی دوور و درێژ و بێ‌وچان

ناڵەیەک کە دەگاتە حەوێقی ئاسمان:

ئاخ دایە گیان!

---

*بوولتووس جۆرێک کارگی گەورەی گۆشتی‌یە کە چەندین رەنگی هەیە و هەندێکیان دەخورێن.

# بۆ بۆریس پاستێرناک

## "شاعیر"١

گوتەی شاعیر ڕێگەیەکی دوور دەپێوێ
شاعیر بە جارێ دەباتە لووتکە
گوتەکانی

لە ڕێی ئەستێرە و ئاماژە و عادەت و
چیرۆکە بەیدەستەکانی مابەین ئا و نا وە
لە دەستەکانیا تەنانەت لەرەی ژامی کلیساکان
دەبنە نیشانەی پرسیار. چون، ڕێگەی گۆ ئەستێرەکان

ڕێی شاعیرە و، ئاڵقەی لێکدابڕاوی هۆکارەکان
لەت لەتی وجوودی ئەون،
لە خۆڕاوە لێی دەگەڕێی "کوسووفی" شاعیر
لە هیچ رۆژ ژمێرێکدا پێشبینی نەکراوە.

شاعیر ئەو کەسەیە وا بۆڕ لە وەرەقی قومار دەدا

تێکیان دەدا، ژومارە و رەقەمەکان
لە پشت میزی قوتابخانەوە هەڵوەدایە بە شوێن وڵامەکاندا،
ئەو کەسەیە بە یەکجاری حاشا لە حەزرەتی کانت دەکا.

ئەوەی لە پشت کێلی قەبرەکانی باستیلەوە
وەکوو لقی درەختی چڕ دەمێنێتەوە و
ئەوەی هەرگیز رچەیەک بە جێناهێڵێ
ئەو شەمەندەفەرەیە هیچ کەس لە کاتی خۆیدا نایگاتێ.

چونکە رێی گۆ ئەستێرەکان
رێگای شاعیرانە: ئەوان قاڵ دەبن بێ ئەوەی گەرم دابێن،
دەدروونەوە بە بێ ئەوەی دابچێنن

ئەوان ئاوان: شۆڕش و تەقینەوەی بێبوار-
هەوراز و نشێوی ئەو رێیەش کە دەیپێون
لە هیچ نەخشەیەکدا تۆمار نەکراوە.

# "شاعیر"٢

ئەوان زیادین لە سووچ و قوژبنی ئەو دونیایەدا دەژین
وەبەر چاو نایەن، تەنانەت لە دەفتەری ڕێنوێن‌دا
ناویان نییە و
حەیفە نان و ئاو و ماڵ و ژیان
بۆوان.

چەند بوونەوەری نابووتە، شیاوی پاڵ پێوەنانن
لە ئەلفەوە نایەنە بێ، بێ‌دەنگ و گێژن چەشنی ڕیخ
پەنجەیەکن پڕیان داوەتە داوێنی پڕ لە شانازی ئێوە
قوڕ و چلپاوێکی خەیاڵین لە ژێر تەگەری ماشینەکانتان‌دا.
ئەوان ئاوان، بە چەشنی نسێی نەبەدی
بە دیاردەی تایبەت بە خۆیانەوە، وەکوو برینی گوڵەکان
ئەو کەسانەن وەک ئەییووب و بەسەبرتر
چەشنێکی وا ئەییوب ئێرەیی‌یان پێ دەبا.
ئێمە "شاعیر"ین دەنگی وشەی دەرکراومان بە دواوە
سەرەڕای ئەوەش لە بەستێنەکانی خۆمان تێپەڕیوین

ئێمە بوێری کێشە لە گەڵ پلەوپایەی خودایی‌مان هەیە
بوێری رقەبەری لە گەڵ خواژن و مەریەمی پیرۆز
لەگەڵ خودی خواش تەنانەت.

# خۆشت دەویستم

خۆشت دەویستم و درۆکانت
راستۆکی تایبەت بە خۆیان هەبوو
هەر درۆیەکت راستەقینەیەکی تێدا بوو
ئەوینی تۆ گشت سنوورەکانی بەزاند
بە شێوەیەک کە ئیتر کەس نەیگەیشتێ.

پێم وابوو کە ئەوینی تۆ
زۆرتر دەخایەنێ لە خودی زەمان
ئێستە دەستم لێهەڵدێنێ بە نیشانەی ماڵئاوایی و
لە ناکاوێک عەشقت بە من کۆتایی دێ و
راستەقینەش تەنیا لەو پێنج پیتە دایە-.

# قەسیدەی کۆسار

لەرزەیەک: لە شانەکانما

لە ژێر رووخەکی ئەم شاخەدا! هەڵفڕینی رووح

لێمگەڕێ ئێستە سترانێک بڵێم لەو خەمەی وا

لێم بۆتە شاخ.

ئەو تاریکاییەی کە هەرگیز

ڕێی هەڵمەتی لێ نابەستم.

لێمگەڕێ سترانێک لە خەم بڵێم

لە سەر ترۆپکی پڕ شکۆی ئەم شاخەوە!

(١)

شاخێک

وەک تەرمی لەت لەت کراوی سەربازێکی جوانەمەرگ

لە حەسرەتی ڕاموسینی کیژێکی خەیاڵی و

بەزم و رەزمی زەماوەنددا،

ئەوە بوو ئەوەی شاخ دەیویست.

کەچی ئۆقیانووسێک لە شەقەی شمشێر و

هاوارە شێتەکان لە گوێیدا زرینگایەوە!

بەڵام شاخ
ویستا و شەڕی کرد!

وەک برووسکە بوو
وەک تەپڵێک لە ژێر زەبری بێئامانی تیتانەکاندا
(وەبیرت دێ دواهەمێن ماڵێ سەر تەپکەکە
لە قەراغ شار؟)
دونیایەکی سەیری بوو شاخ
خوداش تۆڵەیەکی سەیری لە کەسێک کردەوە.
خەم لە شاخەوە دەستی پێکرد و
شاریش ببووە ئامانجی نیگای بەرزی شاخ.

(٢)
نە پارناسۆس و نە سینا
تەنیا تەپکێکی وشکی ئەرتەشی
ئامادە! ئاگر!
ئەدی بۆ لە بەر چاوی من
(لە سەرەتای زستان نەک نێوەڕاستی بەهارێ)
ئەو شاخە لە بەهەشتی بەرین دەچوو؟

(٣)

بەهەشت دیاری دەستێکی بەخشەندە بوو

(دەست بەو دەستە دامەهێنە، گەر دەزانی سوور بۆتەوە)

کە وێڕای جۆگەلە و دۆڵە سەراولێژەکانی

خۆی کێشا ژێر پێمانەوە.

بە پەنجەی تیتانەکانەوە

بە هەموو بژوێن و دارە کاژەکانەوە

شاخ

نەیهێشت بڕۆین و

بانگی کرد:

بمێننەوە!

کتێبی وانەکان چەند بێگانەن لە گەڵ بەهەشت:

ئەو شاخەی وەکوو گژە با

هەڵیلووشین و داوای کرد

ئۆقرە بگرین

لە ئامێزی پڕ مێهریدا.

بە هێزی ئەو راکێشانە لە سەر خۆ دەچووین

چ هێزێک بوو، ئێستاش لە شکۆی سەرم سووڕ ماوە

شاخ دەلالی میهرەبانی بوو نەوەک پیرۆزی،

بانگی کردین بۆ لای خۆی و نرکاندی:

ئا لێرەدا ئۆقرە بگرن.

(٤)

چلۆن دەکرێ لە سەخڵەتی زستاندا

دەنکە هەناری پێرسەفوونە لە بیر بەرینەوە؟

وەبیر دێنمەوە ئەو لێوە نیوە کراوانەی

زیندوو

وەک دوو پەڕی گوێچکەماسی

خوازیاری ماچەکانم بوون.

هەڵوەدایی پێرسەفوونە، لەبەر ئەو دەنکە هەنارە!

بەردەوامە، هەر وەکوو سووری لێوەکان و

برژۆڵی فرمێسکاویت

دەدرەوشاوە، وەک ترووسکەی زێڕێنی هەسارە لە شەودا.

(٥)

نە خەیاڵ بوو نە فریویش

تەنانەت درۆیەکیش- نا- تەنیا عەشقێکی نابەردەوام بوو!

بریا من و تۆش وەکوو خەڵکی رەشایی

روانیبامانە ئەوین و

هەموو شتێکمان هەر بەو جۆرەی کە هەیە، بدیبایە.

(سەرەڕای ئەوەش لە کۆنەوە گوتویانە
بەرزایی شاخ لە قووڵایی دۆڵەکان ڕا دەردەکەوێ.)

کەوابوو لە قەرەباڵغی جەگەنە تاریکەکاندا
لە ناو دوورگەی کاژە وەزاڵە هاتووەکاندا
(لە سەرشێتی و وڕێنە و لەوپەڕی سنوورەکانی لەشدا
-توند لە ئامێزم وەرێنە.

دەربازم کە لە دڵخۆشییە بچووکەکانیماڵەوە
-جووکە جووکی جووجەڵەکان-
چون ئێمە کەوا ئێستا لەو دونیا کاول بووە داین
ڕۆژگارێک لە بەهەشتی بەریندا دەژیاین
لە هەرێمی ئەویندا.

(٦)
کێو دەگریا و شاخەکان شەپۆڕیان دەگێڕا
لە کاتی لێک دابڕاندا، خۆڵەکەشیان خەم دایدەگرێ
شاخ گریا بۆ میهرەبانی کۆترئاسای
کازیوەی غەریبی ئێمە.
شاخ سەردۆلکەی کوت: بۆ عەشقی پڕسۆزی ئێمە

بۆ لێک نزیک بوونەوەی بەردەوامی لێوەکانمان و
ددانی بەوەش داهێنا کە بەشی هەر کەسێک
بە قەت فرمێسکەکانی خۆیەتی.

شاخ خەمبار بوو، چونکە ژیان، ڕەشماڵی قەرەچەکانە
ئێمەش بە درێژایی تەمەن، بازرگانی بە دڵ دەکەین.
ئەمەش وەک کوێرەوەری هاجەر بوو،
شاربەدەر و ڕوو لە دەشتایی بێسنوور
لە گەڵ ڕۆڵە ساواکەی خۆی.

هەروەها شاخ
دانی بەوەش دانا کە هەموو شتێک فێڵێکی شەیتانییە
قاشوولکەیەکی بێمانا
شاخ سەرتاپێ حەسرەت دایگرت و ئێمەش بێدەنگ بووین
هەتاکوو شاخ بۆخۆی ببێتە قازیمان...

(٧)
شاخ گریا بۆوەی ئێستاکە بۆتە خوێن
تینی خوێنیش دەبێتە سەخڵەتی و خەفەت
شاخ گریا

ئەو ناهێڵێ ئێمە بڕۆین
ناهێڵێ تۆش لە توێی نوێنی خەڵکی نامۆدا بڕازێی.

شاخ گریا بۆ ئەو شتەی ئێستا بە دونیا ناسراوە و
بۆ شکۆی ڕۆم کە دەبێتە کاولاشێک.
شاخ گریا، چون ئێمە دەبێ لە گەڵ دیتران بین
(من ئێرەیی بە کەس نابەم.)

شاخ گریا، لە ژێر باری قورسی وادە و بەڵێنەکاندا
بە بێ دەرفەتی دەرباز بوون (لە ژێر ئەو بارە قورسەدا)
شاخ شینی کرد بۆ سروشتی دێرینی
گرێپووچکەی یاسا و ئەوین.
شاخ شیوەنی کرد بۆ گریانەکانی ئێمە، هەروەها.
بۆ سبەینێ، نەک بۆ ئەوڕۆ!
دەخنکێین لە دەریای پڕ مەترسی بیرەوەرییەکاندا،
شاخ گریا
بۆو سبەینێیەی رادەپەڕین
لە خەوی گرانی کەمتەرخەمی.

ئەو دەنگە چ بوو؟

دەڵێی کەسێک لەو نزیکانە دەگریا، بڵێی شاخ بێ؟
شاخ شین دەگێڕێ، چون ئێمە دەبێ دوور لە یەک
لە لێژێکی گنخاوی پڕ لە لیتەدا
بێینە خوارێ.

بەرەو ژیانێک کە هەموو دەزانین هیچ نییە
جگە لە زەنا زەنای بازاڕیی سەربازگەکان و
ئەو دەنگەی دەیکوت هەموو شێعرەکانی کوێستان
بەو شێوەیە هۆنراونەوە.

(٨)
تیتانی دەردەدار، شانەکانی ئەتڵەسە ئێرە
ئەو شارەی کە تێیدا دەژین
لە داهاتوودا شانازی بە شاخ دەکا.

ئەو شوێنەی کایەی ژیانمان لێ بردەوە
بە ڕێزگرتن لە ئەوین و نەک تەنیا هەر بە ژیان ڕابواردن
وەکوو ورچێکی لە لاندا
یان بە چەشنی دوازدە حۆری.

ڕێز لە حورمەتی هەرێمی ئەشکەوتی تاریکی ئێمە بێ.
(ئەشکەوتێک بووم کە شەپۆلە بەرزەکانی دەریای هەڵلووشی)
ئاخۆ لە بیرتە کە دوایین دەستی کایە
لە قەراغ شار کۆتایی هات؟

شاخ... دونیای بێئەژمار... خوداکان
تۆڵە لە هاوشانەکانیان دەکەنەوە
خەمی منیش لەم شاخە را دەستی پێکرد،
کە ئێستە وەکوو کێل لە سەر سەرم رادەوەستێ.

(٩)
ساڵەکان تێدەپەڕن و پاشان ئەو گاشە بەردە مەزنە
هەڵدەکەنرێ بۆوەی لەت لەت ببێتە کێل
ماڵە کوێستانییەکان بینا دەکرێن
لە سەر جەستەی شاخی ئێمە
دەوران دەوری ئەوانیش بە زوویی
بە باخەکان دادەپۆشرێ.
چونکە لە دەرەوە
لە جێیەکی وەکوو داوێنی ئەو شاخە

ئەوان هەوایان پێ خاوێنترە و ژیانیش ئاسوودەتر
کەوایە زەوییەکەی لەت لەت دەکەن و
داربەستێکی زۆریشی لێ دەچەقێنن.

ئەوان رچە کوێستانییەکانی ئێمە بیراز دەکەن و
هەموو دۆڵە قووڵەکانی ئەو داوێنە
لە گەڵ زەوی تەخت دەکەن.
ئەوان دەیانهەوێ بەختەوەری ببەنە ماڵەوە و
بەختەوریش بن، هەروەها.
بەختەوەری لە ناو ماڵدا! ئەوین، بێ فڕ و فێڵ
جوان بیری لێبکەوە: بە بێ هەوایەکی نوێتر.
من دەبێ ژنێکی وا بم، تابشتی ئەوانە بێنم
(بەختەوەری هەبوو- بەختەوەری راستەقینە-
ئەو دەمانەی تۆ دەهاتییە ماڵەکەی من)
ئەوینێک بە بێ تەزووی شیرینی دووری
یان زەبری کاری نەشتەرێک.
ئێستاش لە سەر وێرانەی بەختەوەریی ئێمە
شارێک بینا دەکرێ: لە ژن و پیاوەکان
هەر لەو هەوا پیرۆزەدا، کە تۆ و
هەر کەسێکی دی دەبێ عاشق بن-

بەو زووانە کاسبکاران کاویژی دەکەنەوە

ژمارەی زۆری قازانجەکانیان

بەردەوام کەڵکەڵەی پێشکەوتن و ژیانی باشتر

بە جۆرێک کە هەموو شتێک ڕێی ماڵیان پێ دەنوێنێ

چون دەبێ ئەوێ کەسێکی لێ بێ

موحتاجی میچێک لە چەشنی هێلانەی حاجی لەگلەگ.

(١٠)

سەرەڕای ئەوەش لە ژێر قورسایی ئەم بینایانەدا

شاخ قەت یاری لە بیر ناباتەوە

خەڵکی گەرچی لاڕێ دەڕۆن... بەڵام دەبێ لە بیریان بێ.

شاخ پڕاوپڕە لە کۆساری سەدەکان.

قەڵەشت و درزە قووڵەکان دەمێننەوە

خاوەنی ماڵە کوێستانییەکان درەنگ تێدەگەن

ئێرە تەپکێکی داپۆشراو بە خانوو نییە

بەڵکوو

گڕکانە ئێرە و

(ئێوە بیر لەوە دەکەنەوە چۆن پارەی لێ وەدەست بێنن.)

داخۆ ڕەزەکان هەرگیز بیر لە مەترسی و سووییووس دەکەنەوە!
گیگانتەکان قەت قەت لە مەرگ ناترسێن
چون گیای سیحراوی‌یان پێیە و
ئاخی بە سۆزی دڵەکانیش بە تەنیا
هەر ئەوەندەی لە تاقەتدا:
هێندەی ڕەزەکان وەجۆش دێنێ و دەیانگۆڕێ
هەتا بەردی قاڵکراوی نەفرەت خۆیان، بڕشێنەوە
هەموو کیژۆڵەکانتان دەبنە سۆزانی و
تێکڕای کوڕەکانتان شاعیر!

تۆ ساوایەکی زۆڵ گەورە دەکەی کچم!
تۆ پیاوەتیت دەنێیە ژێر پێی قەرەچانەوە کوڕم!
ئێوە کە بە خوێنی من هەستی‌تان پاراو دەکەن
خۆزگە قەت قەت بە خاوەنی زەوی بە پیت و بەرەکەت نەبن.

نەفرەتتان لێ‌دەکەم:
ڕەقتر لە هەموو بەردی بناخەیەکی قایم
نەگۆڕ وەک وەسیەتی پیاوێک لە سەرەمەرگدا:
یاخوا قەت بەختەوەر نەبن
ئێوەیەک کە وەکوو مۆرکە شاخەکەی من هەڵدەکۆڵن!

لە ساتێکی دوور لە چاوەڕوانی و لە کاتێکی نادیاردا

ئێوە، یەکە یەکە دەزانن

چەند مەزن و بێسنوورە

یاسای حەوتەمی خودا... شاخ -

سەرچاوە:

١-تسوەتایو،مارینا( (١٣٨٠)گزینە اشعار، ترجمە فریدە حسن‌زادە، تهران:انتشارات نسیم دانش

٢-تسوەتایوا،مارینا(١٣٨٠)شاعر برگزیدە قرن بیستم، ترجمە فریدە حسن‌زادە، مجلە شعر، شمارە ٢٩

## لە چاوە تەڕەکانی ئەرمەنیدا

## شێعر و ژیانی "شووشانیک گوورقینیان"



شووشـانیک پووبوولجیـان ناسـراو بـه شووشـانیک گوورقینیـان ژنـه شـاعیر و چـالاکی کۆمەڵایـەتی ئەرمەنییـە، سـاڵی ١٨٧٦ ی زایینـی لـه شـاری ئەلکساندرا پۆل، واتـه لنیناکانی ئـەورۆ لـه ئەرمەنسـتانی رۆژهـەڵات لـه دایک بـووە. خوێنـدنی سـەرەتایی و ناوەنـدی لـه قوتابخانـەکانی شـاری شـوێنەزای خۆی تەواو کردووە، بەڵام بە هۆی دەستکورتی و نەداری بواری ئەوەی بۆ نەڕەخسـا درێـژە بـه خوێنـدنی بـاڵا بـدا و کەش‌وهـەوای زانکـۆ و خوێنـدنی زانکـۆیی تـاقی بکاتـەوە. سـاڵی ١٩٠٠ی زاییـنی بـەرەو روسـیای تێزاری کـۆچ دەکا. ماوەیەکی دوور و درێژ لـه شـارە جـۆر بـه جـۆرەکـانی رووسـیا گـەڕا و بـه شـێوەیەکی راسـتەوخۆ لـه گـەڵ داب‌ونـەریت و بـاری کۆمەڵایـەتی و دەروونییـان ناسـیاوی پەیـدا کـرد. شووشـانیک تێکـڕای ژینـی تـەرخانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان کرد. ساڵی ١٩٢١ گەڕاوە ئەرمەنستان و له سـاڵی ١٩٢٧ دا له شاری یەرەوان به هـۆی نەخۆشـی ئازارەباریکەوە کۆچی دوایـی کرد.

شووشـانیک لـه سـاڵی ١٨٩٠وە دەسـتی کـرد بـه وەشـاندنی بەرهەمـه شێعرییەکانی خۆی و له ماوەیەکی کورتدا گەلێ بەرهـەمی لـه گۆڤارەکـانی ئەرمەنسـتانی رۆژهـەڵات و رۆژئـاوادا بـڵاو کـردەوە. یەکـەم کۆمەڵـه شـێعری ئەو ژنه شاعیرە بە ناوی "زەنگی بەربەیان" له ساڵی ١٩٠٧دا بڵاو بۆوە.

شووشـانیک گوورقینیـان لـەو ژنـه شـاعیرانەیە کـه ئەرکێکی بـەرزتر لـه ئەرکی ماڵداری و منداڵپەروەری وەئەستۆ گرتووە. ئەوەش بـەو مانایـه نییـه کـه ئـەو ئەرکانـه لـه روانگـەی کۆمەڵایەتییـەوە بێبـایخن، بـەڵکوو مەبەسـت

ئەوەیە گوورقینیان سەرەڕای ئەو ئەرکانە، بەشێکی زۆر لە توانای هونەری خۆی بۆ خستنەڕووی ژان و دەردی مێژوویی گەلەکەی خۆی تەرخان دەکا.

گەلی ئەرمەنی لەو گەلانەیە کە ماوەیەکی زۆر لە ژیانی خۆی لەژێر رکێفی زۆردار و چەوسێنەر و خوێنڕێژانی دەستەڵاتداردا ژیاوە. ساڵ و عەیامێکی زۆر ژن و پیاو و پیر و لاوی ئەو گەلە رەسەنە ژێرچەپۆکە بوون و زۆرداران و دەستەڵاتدارانی کەڵەوەکێش، حەولی تواندنەوەی نەتەوەیی ئەوانیان دا و تەنانەت تا سنووری ژینۆساید و خاشەبڕکردنی ریشەی نەتەوەییان چوونە پێش، بەڵام گەلی ئەرمەنی کە خاوەن شارستانییەت و زمان و کولتووری سەربەخۆ و پتەو بوو، بە درێژایی ئەو ساڵانە ئەگەرچی لە ژێر نیری چەوسانەوەدا ناڵاندی، بەڵام بەچۆکدا نەهات و بەرخۆدان و رابوونی بەردەوامیان بووە هۆی ئەوەی بمێننەوە و ببنە چقڵی چاوی دوژمنانیان. یەکێک لەو شتانەی یارمەتی مانەوە و متمانەبەخۆیی ئەو گەلە زوڵم لێکراوەی داوە، هەست بە بەرپرسایەتی کردنی نووسەران و شاعیرانی نەتەوەیی ئەرمەنییە. شاعیرانی ئەرمەنی بەشێکی زۆری ژانی گەلەکەیان خستە سەرشانی خۆیان و بوونە دەنگی دلێری نەتەوەکەیان و دەنگ و رەنگی حەقخوازانەی گەلەکەیان لە رێی شێعری خۆڕاگری و شۆڕشگێڕانەوە گەیاندە گوێی هەموو رۆشنبیران و نووسەرانی بە ویژدانی دونیا.

هەر لەبەر ئەو هۆیەشە جاری وایە نزیکایەتییەکی سەیر لە مابەین شێعری ئەرمەنی و شێعری کوردیدا بەرچاو دەکەوێ. شێعری ئەرمەنیش

وەک شیعری کوردی تەنیا ڕەنگدانەوەی هەستی جوانیناسانەی شاعێر نییە، بەڵکوو جوانیناسییەکەشیان لە ژێر کاریگەری هەستی نەتەوەییدا گووراوە. شاعیری ئەرمەنی وەک شاعیری کورد لە لایەک ئەرکێکی هونەری لە ئەستۆیە و لە لایەک وەک هونەرمەندێک پیویستە جوانکارییە ئەدەبییەکان ڕەچاو کا و بەرهەمێکی ئەدەبی بەرپرس بەڵام بەهێز بخوڵقێنێ. شێعری ئەرمەنی روخسارێکی پڕ پەژارەی هەیە، چون بزوێنەری شاعیرانی ئەرمەنی ئەو بارودۆخە بووە کە باڵی وەسەر وڵاتەکەیان کێشاوە و بە درێژایی زەمانیش ئەو بارودۆخە کەمتر لە بەرژەوەندی ئەواندا بووە.

شووشانیک گوورقینیان یەکێک لەو ژنە شاعیرانەی ئەرمەنییە کە پێ بە پێی شاعیرانی پیاوی گەلەکەی، شیعری بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنان و نەیارانی گەلەکەی نووسیوە. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە شێعری ئەو ژنە شاعیرە مەزنە شێعرێکی تووڕە بەڵام بەرز و پتەو بێ. لەو وەرگێڕانەدا حەولم داوە بەشێک لەو شێعرانەی گوورقینیان وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی، کە بە باشی ئەو دیاردانەی باسمان کرد نیشان بدا. لە شێعری "خەمۆک"دا شاعیر چاوی بڕیوەتە مێژووی گەلەکەی و بە نیگایەکی پڕ لە ژانەوە تێیدەڕوانێ و پێی وایە ئەوە چاوی مرۆڤی ئەرمەنییە کە بێبڕانەوە وەک رووبارەکان بووەتە چاوەی ئەسرین و ئەوە سینگی ئینسانی چەوساوەی ئەرمەنییە کە ژان و هاوار تێیدا پەنگی خواردۆتەوە، بەڵام وەک هەر شاعیرێکی شۆڕشگێڕ ڕێی خۆڕاگری و ڕووبەڕوو بوونەوە نیشان گەلەکەی دەدا. لە شێعری "منی شاعیر"دا خۆی بە شاعیری

سەرەمەرگی پڕ لە ترس و ڕۆژەڕەشی دەزانێ، کە بۆ زیندوو ڕاگرتنی یادی خەبات و لە خۆ بوردوویی کوڕان و کچانی ئەو گەلە سترانی خوێن دەخوێنێ، بەلاَم بەردەوام هیوا بۆ ڕزگاری و بەختەوەری گەل لە ناخی شێعرەکانیدا خۆ دەنوێنێ، ئەگەرچی ئەو هیوایە وەک بۆخۆی دەڵێ بە شەپۆلی ئەسرینیش پاراو بووبێ. شێعری "هەلَۆ"ش کە نیشاندەری هەڵبژاردنی جۆرێک ژیانی بوێرانە و مێرانەیە، وەک زۆربەی ئەو شێعرانەی بەناوی هەلَۆ نووسراون، سیلە چاوێکی لە هەلَۆی پووشکین بووە، بەلاَم جیاوازی لە گەڵ شێعرەکانی هەلَۆی دیکە لەوە دایە کە لەو هەلَۆیەدا، دەمەتەقە و ڕووبەڕوو بوونەوەی هەلَۆ و قەل لە ئارا دا نییە، ئەگەر لە هەلَۆکانی دیکەدا هەلَۆ هێمای ژیانی سەربەرزانە و مرۆڤی سەربەرزە و قەل بە پێچەوانە ژینێکی پڕ لە گەندەڵی، ژێرچەپۆکەیی و سووک و چرووک دەنوێنێ، لەو شێعرەی شووشانیکدا ڕاستەوخۆ ژینی هەلَۆیانە دەنەخشێندرێ و لە بەرامبەری دا ژینی ئینسانی دەخرێتە ڕوو، کە لە نێو ژاوە ژاوی کاری ڕۆژانە و لە جەغزی ژانی ژیاندا بەستراوەتەوە. ئەو شێعرە ڕوانینێکی ڕەخنەگرانەی هەیە بۆ بارودۆخی مرۆڤی هاوچەرخ بە گشتی و تەوسێکە بۆ ئەو مرۆڤە ناکارامانەی لە بارودۆخی نالەباردا کەمتر کردەوەیەکی بە کەڵک لە خۆیان دەنوێنن. هەر بۆیە لەو شێعرەدا ئەگەرچی شاعیر کورتی بڕیوەتەوە بەلاَم لە گەڵ زمانێکی پتەو و بیرێکی نوێ و تا ڕادەیەک جیاوازتر لە هەلَۆکانی دیکە بەرەو ڕووین.

# خەمۆک

دانیشتووم لە رۆخی چۆمی پڕ لرفەدا
خەمۆک و دڵتەنگ بیر دەکەمەوە.
دەڕوانمە شەپۆلەکان و گوێ دەدەمە گێژاوەکان...

من بیر لەوە دەکەمەوە
کە ئەو چەمە لە مێژ ساڵە
-بە تنۆکی هەزاران جۆباری رووناک
رچەی لە سینگی زەویدا کردۆتەوە و -
هێور دەخوشێ...

گەر لە چاوە تەڕەکانی ئەرمەنیدا
فرمێسکەکان تێکەڵ بوایەن
وەک سێڵاوێکی تۆفانی
رێی دەشت و کێویان گرتبا بەر...
گەر لە خوێنی بێتاوانی ئەرمەنیدا
چەم و جۆبار هەر لرفەیان بهاتبایە و

بەستێنی تازیەباری خوێناوی
سەدە بێ ئەژمارەکانیان
بە گورزی شەپۆل بکوتابا

گەر لە سینگی ئەرمەنی را
هاوارەکان هاتبانە دەر
بووبانە- با و
بە ژانی رووخێنەرەوە گرماندبایان

هەزاران دەردی بێدەرمان
شەپۆلانی خوێنیان دەچڕی
لە هێمنی سترانێکدا و
با- ش بە دەم زەمزەمەیەوە
سەدان چریکەی خەمینی دەلووراندن.

# من شاعیرم

من شاعیری سەرەمەرگی پڕ لە ترس و رۆژە رەشیم
بەهاری ژینم نەدیوە
گوڵێکی جوانم نەچنیوە.

من سیسرەی کاولاشەکان و
درزی رووخەکی ئەو شوێنەم
ئێستاش خۆڵەمێشەکەی هەر گەرمە و
دەنگی بایەقووشی لیَدێ.

ئەمن جۆباری فرمێسکی
جەزرەبەی گەلی چەوساوەی خۆمم
کە تا ئێستاش وشک نەبووم
لە سەر زەوینیش ون نەبووم.

من شاعیری سەرەمەرگی پڕ لەترس و رۆژە رەشیم
سترانی خوێنم خوێندووە و
هیوام بە شەپۆلی ئەسرین
پاراو بووە.

## پێم خۆشبوو...

پێم خۆشبوو تۆم بدیبایە کە لە قووڵایی لەشمدا
وەک ڕێبوارێکی کۆچەری
ڕێگاکەت هەتڵە کردووە.
ڕۆژ و شەو
بە بێ خوارد و خەو
وەکوو خودا سەنات دەکەم

پێم خۆش بوو لە باخچەیەکی لە پڕ گوڵدا
تۆم... وەک بولبولی باڵ کراو...ڕاگرتبایە
تا لە توێ توێی چرۆی خەیاڵەکانمدا
بیسترابا
ئاوازە سەوز و گەرمەکەت
کە ئەو دڵەی من دەیخوازێ.

پێم خۆش بوو هەتاهەتایە لە سینگمدا رامژاندبای
بە لایە لایەو ژانی بێ ئامانەوە.

کە مردیشم
با کێلەکەم
لە رەوەزە ئەستەمەکانی دڵی تۆ داتاشرابا.

# هەڵۆیەکە ئەندێشەی من

هەڵۆیەکە ئەندێشەی من
لە دەشتی ئاسمانی شینڕدا
لە ناو ئامێزی ئێکسیردا
ڕەها و ئازاد...وێڕای هەموو خولیاکانم و
لە ڕیزی بێکۆتایی خەیاڵی داگیرساوم دایە-
ئەو شارەزای هەڵفڕینە.
شنەیەکە ئەندێشەی من
لە لای ئەستێرەکانەوە، بە شوێن مانگدا
لە باڵە نەرمەکانی هەوردا
لە پانتایی هەورازی دونیای نەمردا دەشنێتەوە...
ئەو لە ڕاکردن وەستایە.
شەونمێکە ئەندێشەی من،
لە پێدەشتە سەوزەکانڕدا، لە سەر پەلکی گوڵەکان
لە نێو گژ و گیای تێکهەڵچوو، قەوزە و سونبول
لە سەر باڵی سوور و سەوزی چرۆکانەوە
دەتکێتە پەردەی خەوەوە.

لافاوێکە ئەندێشەی من

بەرەو ساتە بێهیواکان و

ژانی تاقەتپرووکێن

بەرەو رقی ترسەنۆکی دەم هەرەس و

ژیانی بە تاڵانچووی پڕ مەینەت

بەرەو ئاسەواری بەخت

دەخرۆشێ و هەرگیز ناسرەوێ.

رووبارێکە ئەندێشەی من

دەرژێتە ناو دۆڵی مەرگی

ژیانێکی خۆشی نەدیو

دەنگی ئاوێتەی هاواری ژان کردووە و

لە گەڵ هەنیسکی بەردەوامی گریانێکی زۆر بەکوڵ

بۆتە هاودەنگ.

ئاگرێکە ئەندێشەی من

بەربۆتە دڵی ناشادی

پڕ لە یەخسیری و هەژاری و

ژاری تۆڵەی نادیاری چەوسانەوە

وەک مەشغەڵ دایدەگیرسێنێ.

# هەڵۆ

لە بەرزایی
تەختی سینگی تاشە بەردێک
رووەو هەردێک
بە ئارامی
نیشتبوو هەڵۆی بەرزەفڕ...

مات و پەشێو
باڵی بەرز و شەکەتی خۆی
بە ئارامش سپاردبوو،
تەنیا خۆی هەڵاواردبوو و
دەیڕوانییە،
پێدەشتێکی وشکی قاقڕ:

_ ئەو خوارە چەند خەفەتهێنە
لەو دۆڵەدا
لە سەرتاسەری ئەو گۆی عەردە
پڕ لە بەردەدا

مرۆڤەکان؛

له ژێر نیرێکی قورسدا هاوار دەکەن

دەناڵێنن له دەست ژانی بەندیخانه

له داخی ژینی کۆیلەیی و

هەژاری و ژان هاواریانه.

من له هەموویان بێزراوم

ئەمن...باڵندەی بێزەمان

رۆڵەی هەرمان-

ئازاد له ژێر کەپری ئاسماندا ژیاوم...

دەنگێکی بەهێزم هەیه و

چریکەم رەوەزا و رەوەز زایەڵەی دێ...

قەت به عەرزیدا ناخزێم

وەک خشۆکێکی بێڕەزای نەفرەتاوی

که تاریکی باڵی بەسەردا کێشاوه

منم باڵندەی بەرزەفڕی هەتاوی...

هەرگیز نەمدیوه مرۆڤی ترساو

له بەرزایی تێپەڕیبێ و

هەوای به شکۆی

دەشتی شینی ئاسمانی

بە ئازادی هەڵمژیبێ،

بە چەشنی من

تیژباڵ و تینووی هەڵفڕین

نەمدیوە کەسێک فڕیبێ...

لە ژیاندا

چی لەوە شیرینتر هەیە؟

بە دڵێکی پڕ هیواوە

گشت ئاسمانەکان بکێڵی

مەودایەک بۆ خەم نەهێڵی...

هەڵدەفڕم بەرەو دوورە دەستەکان

ئازاد، بێ لەمپەر و رزگار

بەرەو ئەو پەڕی

بەرزاییە سەربەستەکان

بەرز دەفڕم

بە بێ ترس و دڵەڕاوکە

بە شاباڵم هەناوی هەوا هەڵدەدڕم.

هەڵۆ وای گوت و

شەقەی شاباڵی

وەکوو تیرێک

هەوای بەرەو خوار راماڵی

لە خوارەوە

لە داوێنی ئەو رەوەزە

مرۆڤی هەژار دەناڵی

لە دەست رێژنەی ژانێکی وا

کە ژینی ئەو پێی خووساوە...

لە دەست ژینێک

داغی نەفرەت بە تەوێڵی‌یەوە نووساوە...

# بۆ ژین

هەموو شتێک دەبێ بۆ ژین بدۆڕێنی
هێزو توانا و شادمانی و هەموو رۆژانی لاوەتی.

دەبێ بەر بە فرمێسک بگری
لە کاتی ژاندا، بێ ترس و دڵەدوایی.
پێکەنین لە بیر بەریەوە و
خۆشەویستی و دلۆڤانی رەچاو بکەی.
بۆ ژیان دەبێ هەمبەری نەمان بییەوە
(بەختەوەرییەکی پیرۆزە قەت پیر نابی)
زەمانیش بێهۆ گاڵتەی خۆی دەکا
بەزیوی دەست ورەی تۆیە و بێ ناو نیشان
تێدەپەڕێ.
بە جێی هەنگاو نان هەڵفڕین!
گەر کەوتیشی خەم داتنەگرێ
ئەوەی لە بەرزایییەوە بەربۆتەوە، قەت ناکەوێ.
لێگەڕێ با گیانت لە سەر ددانی دەرد دابمرکێ!
سەرکوتکردنی ژین
بۆ ژین...

سیلویا پلات لە ساڵی ١٩٣٢ لە ماساچۆسێتی ئامریکا لە دایک بوو. هەشت ساڵان بوو باوکی بارگەی بەرەو دونیای تر پێچاوە و ئەویش بێکەس و تەنیا کەوتەوە. خوێندنی سەرەتایی لە شاری شوێنەزای خۆی تەواو کرد، لە زانکۆی ئێسمیت وەک خوێندکار وەرگیرا، لێهاتوویی و کارامەیی خۆی لە خوێندندا دەرخست و بە باشترین پلەوە زانکۆی تەواو کرد. سیلویا لە ساڵی ١٩٥٣دا بیری خۆکوژی لە کەللەی دا و ویستی بە خواردنی پەنجا قورسی مەترسیدار کۆتایی بە ژیانی بێنێ، بەڵام بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر لە مەرگ رزگاری دێ. چەند ساڵ دواتر بوورسێکی خوێندن لە زانکۆی کەمبریج وەردەگرێ و روو دەکاتە بریتانیا. لەو زانکۆیە لە گەڵ شاعیری پایەبەرزی ئینگلیسی "تێد هیوز" ناسیاوی پەیدا دەکا و لە ساڵی ١٩٥٦دا زەماوەندی لە گەڵ دەکا. سیلویا پلات یەکێک لە گەورەترین شاعیرانی ژنی جیهانە و شێعرەکانی بە هەموو زمانە زیندووەکانی دونیا وەرگێڕدراون. ئەو مەزنە شاعیرە، بە هۆی جیا بوونەوە لە مێردەکەی تا دوا ساتەکانی تەمەنی لە گەڵ منداڵەکانی بە تەنیا دەژی و سەرەنجام ساڵی ١٩٦٣، لە تەمەنی سیویەک ساڵاندا بە گاز خۆی دەخنکێنێ.

سیلویا پلات لەو تەمەنە کەمەیدا کۆمەڵێک بەرهەمی بەنرخی خستە سەر خەرمانی ئەدەبی جیهانی. کۆی بەرهەمەکانی بریتین لە پێنج کۆمەڵە شێعر و رۆمانێک بە ناوەکانی:

١- کلۆسووس و چەند شێعری دی

٢- ئاسک

٣- تێپەڕین لە ئاو

٤- دارەکانی زستانی

٥- کۆی شێعرەکان

٦- ڕۆمان – ژیاننامەی (تۆقلەی شووشە)

لەو نووسراوەیەی بەر دەستدا حەول دراوە شێعری "خاتوو ئیلعازر"ی سیلویا پلات و ڕەخنە و خوێندنەوەی "دکتۆر زیای موەحید" وەرگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی. ئەو شێعرە لە چەند لایەنەوە جێی سەرنجە. یەکەم ئەوەی کە بەشێک لە دەرد و خەمۆکی‌یەکانی سیلویای تێدا حەشار دراوە و دووهەم ئەوەی کە شێوە ڕوانینی ئەومان بۆ مەرگ و ژیان پێ‌دەنوێنێ، جگە لەوەی کە خوێنەر لە گەڵ هەڵسوکەوتی زمانی ئەو شاعیرە مەزنەش ئاشنا دەبێ...

# خوێندنەوەی شیعری خاتوو ئیلعازر

شیعری خاتوو ئیلعازر درێژەی شیعری ئوستوورەی باوکە و دوای ئەویش هۆنراوەتەوە. پاش رزگار بوون لە بیرەوەری مێرد و باوک، نۆرەی لە دایک بوونێکی دیکەیە. لە شێعری خاتوو ئیلعازردا، چەندین ئوستوورە و ئەفسانە پێکەوە گرێ دراون. رواڵەتی سەرەکی ئەو شیعرە، کەسایەتی چیرۆکێکە کە لە ئینجیلی یوحەننادا هاتووە و وەک دیسان ژیانەوەی مەسیحیان لێکداوەتەوە. بە پێی بەشی یازدەهەمی ئینجیلی یووحەننا، عیسای مەسیح پیاوێک بەناوی ئیلعازر چوار رۆژ پاش کفن و دفن کران و نێژرانی، زیندوو دەکاتەوە:

**عیسا چاوانی خۆی هەڵێنا و کوتی باوکی بەرز سوپاست دەکەم کە دەنگت بیستم * دەشمزانی بەردەوام قسەکانی من دەژنەوی، بەڵان لەبەر ئەو حەشامەتەی لێرە حازرن، ئەوەم گوت، بەڵکوو ئیمانی بەخێر بێنن و ئەتۆش منت هەر بۆیە راسپاردووە * هەر ئەوەی گوت بە دەنگی بەرز هەرای کرد، هۆ ئیلعازر وەرە دەرێ * دەست و بە جێ ئەو مردووە کە دەست و پێی بە کفنەکە بەسترابۆوە لە گۆڕ راسا، بە دەسرەیەک روخساری داپۆشرابوو، عیسا گوتی بیکەنەوە و ئینجا لێی گەڕێن با بڕوا ***

سیلویا پلات لانی‌کەم شەش ساڵ دوای هۆنینەوەی ئەو شیعرە و پاش تێکچوونی باری دەروونی و یەکەم خۆکوژی لە ساڵی ١٩٥٣دا، لە یادداشتێکدا دەڵێ:

هەستێکی وەک ئیلعازرم هەیە. چیرۆکێکی زۆر سەرسووڕهێنەرە. مردبووم. دیسان ژیامەوە.

ئەوە بۆمان دەردەخا هەتا هۆنینەوەی ئەو شێعرە لە ئۆکتۆبری ١٩٦٢دا، ئەو چیرۆکە چەند جار لە زەینی ئەودا جێی خۆش کردووە و پەروەردە بووە. لێرەشدا شاعیر چیرۆکەکە دەست تێوەر دەدا و کاکی ئیلعازر دەکاتە خاتوو ئیلعازر. ئەوە سەرەتای تەنزێکی تاڵە بۆ دەربازبوون، لە دەست زاڵبوونی هەست و هەڵپە. بەڵام سەبارەت بە لایەنی ئووستوورەیی ئەوشێعرە سیلویا ئاوا دەدوێ:

ژنێکە کە توانایی و لێهاتوویی‌یەکی ترسێنەری بۆ لە دایک بوونەوەی سەرلەنوێ هەیە. تەنیا باری دژواری کارەکە لێرە دایە کە دەبێ سەرەتا بمرێ. ئەو ژنە وەک قەقنەس وایە. رووحێکی رزگارە، یان هەرچێکی ئێوە پێتان باشە، هەروها ژنێکی باش و ساکار و زۆر لایەق و بەتوانایە.

ئەو وێنەی دووبارە ژیانەوەیە لە ئەدەبیاتی گەلاندا، مێژینەیەکی کۆنی هەیە. شێعرەکە ئاوا دەست پێدەکا.

دیسان ئەم کارەم کردەوە

دە ساڵ جارێک

من وا دەکەم

شێعرەکە لە زمان کەسایەتی ئەو چیرۆکەوە دەگێڕدرێتەوە. ژنێک کە هەر دە ساڵ جارێک ناچارە خۆی بکووژێ تا سەر لەنوێ لە دایک بێتەوە و ژیانێکی راستی وەدەست بێنێتەوە. لە بەشێکی شێعرەکەدا دەڵێ:

ئەوە جاری سێهەمینە

چ نەهامەتییەکی رەشە

بە هەر دە ساڵ جارێک مردن.

هەڵبەت شێعرەکە دەربڕینی راستەقینە نییە. سیلویا پلات دوو جار ویستی خۆی بکووژێ. بەڵام دەوامەی ئوستوورەیی دەخوازێ کە ئەو جارەیان ببێتە جاری سێهەم. بە تایبەت کە ژنەکە ئێستا بۆتە سی ساڵان. شیعرەکە لێرە را بە کەم زانینی ئەو کەسانە لە خۆ دەگرێ کە ئەویان ناچار کردووە خۆی بکووژێ. دیمەنی تر، دیمەنی ترسێنەری زیندووبوونەوەی ژنەیە. بینەران بۆ بینینی ئەو دیمەنە هێرش دێنن.

حەشیمەت توو دەترووکێنن و هێرش دێنن

تا ببینن

چۆن رووت دەکەنەوە

دەست و پێم

ئیستریپتیزی مەزن

جا دوایە نۆرەی ئەو وتە پڕ خۆفە دەگاتێ:

خوشکان، برایان

ئەوە دەستەکانی منە

ئەوە ئەژنۆکانی منە

هەر پێست و ئێسکێکە و چی تر

بەڵام من هەر هەمان ژنم، هەمان!

ئەو راوێژە وەبیرهێنەرەوەی راوێژی مەسیحە و لە راستیدا ئاماژەیە بۆ مەسیح لە کاتی گەڕانەوەی سەرلە نوێیدا. لە ئینجیلی لووقا بەشی بیست و چوارەم و ئایەتەکانی ٣٦ هەتا ٤٠ دا ئاوەها نووسراوە:

کوتوپڕ عیسا بۆ خۆی لە نێویاندا راوەستا و پێی کوتن سڵاوتان لێ بێ. * بەڵام ئەوان دەترسان و وەک مێوژۆکە هەڵدەلەرزین، پێیان وابوو رووح دەبینن. * پێی راگەیاندن بۆ شێواون خەڵکینە؟ بۆچی شک و دڕدۆنگی بە دڵ و هەناوتان وەر بووە * جوان بڕواننە هەر دوو دەست و لاقەکانم، جا ئینجا بۆو دەردەکەوێ کە من خۆمم، وەرن دەست لە لەشم بسوون و ببینن، چونکە رووح خۆ گۆشت و ئێسکی پێوە نییە و... *

بەڵام شێعرەکە توێژێکی بەژانی دیکەشی هەیە. وێدەچێ ئەوشوێنەی لە ژێر کاریگەری چیرۆکێکی کافکا دابێ. چیرۆکی ئەوپیاوەی پاڵەوانی برسێتی چەشتنە و چل رۆژان خۆی لە رکەیەکدا دەبەستێتەوە و دەم لە خواردەمەنی نادا. ئەو کەسەی ماوەی چل رۆژ بۆ نەخواردن دیاری دەکا، بەڕێوەبەری ئەو شانۆ خەفەت هێنەیە. پاش چل رۆژ بەڕێوەبەری شانۆکە رێورەسمێکی بەشکۆ سازدەکا. لەو رێورەسمەدا کە بە هەزاران دەسکە گوڵ و گرووپی موسیقا و کچی جوان و لەبار رازاوەتەوە، تاقمێک کە توو دەتروکێنن، هێرش دێنن تا پاش چل رۆژ، خواردنی پاڵەوانەکە ببینن، هەڵبەت

بۆ دیتنی ئەو دیمەنە دەبێ پوولێکیش بدەن. بەڵام ئەو کەسەی کە زیاتر لە هەموان دەزانێ پاڵەوانێک لە گۆڕێدا نییە و ئەو کارەی کراوە قارەمانانە نەبووە، هەر خودی کابرای برسێتی چەشتووە. لە چیرۆکەکەی کافکادا پاڵەوانی برسێتی دەڵێ:

"پێویست نییە بارەقەڵلام پێ بڵێن، چون من ناچارم برسێتی بچێژم، ناتوانم وا نەکەم ... ئەو خواردەمەنییەی دەمهەویست دەستم نەدەکەوت، بڕواتان بێ ئەگەر وەدەستم کەوتبایە پێویستی بەو هەڵلا و بگر سازدانە نەبوو، وەکوو ئێوە هێندم دەخوارد تا مڕ دەبووم"

قسەی خاتوو ئیلعازریش ئەوەیە. ئەگەر ژیانی ئەو هەر ئەو شتە با کە ویستی خۆی بوو، پێویستییەک بەو خۆکوشتن و وەدوای راستەقینەی خۆ کەوتنە نەدەبوو، ئەو دژی ژیان نییە، دژی ئەو جۆرە ژیانەیە. سیلویا هەر بەوەندە سوکنایی نایە و تا کۆتایی شیعرەکە خۆی هێندە بە ئەشکەنجەکراوی دەنوێنێ، کە ئەشکەنجەدەرەکان تا رادەیەکی یەکجار زۆر سوک و چرووک ببنەوە و لە بەر چاو بکەون. شیعرەکە ئاوای کۆتایی پێدێ:

بزانن و ئاگادار بن

بزانن و ئاگادار بن

لە دڵی خوڵەمێشەوە

بەقژی سوور دەردەکەوم و

وەکوو هەوا

گشت پیاوەکان هەڵدەلووشم.

ئـەو شـیعرە زمـانێکی سـاکار و رۆژانـەی هەیـە. دێڕەکـان کـورتن و شـیعرەکە بـە کۆپلـەی سـێ دێڕی و کێشدار دابـەش بـووە. لـەو شـیعرەشدا ئامـاژەی بـەردەوام بـۆ شـەڕی جیهـانی دووەم و ئۆردووگـای مـەرگ و جینایەتی نازیی‌یەکان بەرچاو دەکەوێ. رستەی "پێستم بە چەشنی شـەوچرای نازیی‌یەکان دەدرەوشێتەوە" بە جوانی سەرنجی شاعیر بۆ ئـەو بابەتە نیشان دەدا. ئـەو رسـتەیە ئاماژەیـە بـەوەی کـە نازیی‌یـەکانی ئاڵمـان لـە پێسـتی جوولەکەکان کەپریان بۆ چراکانیان ساز دەکرد. دوایین کۆپلـەی شـێعرەکەش کە باسـی دەرکەوتنـەوە لـە دڵی خۆڵەمێشـەوەیە، ئامـاژە بـۆ قەقنـەس باڵندەی ئوسـتوورەیی دەکا کـە لـە ئـاوری خـۆی‌دا گڕ دەگرێ و دوای چەنـد سـەدە دیسان لە نێو خۆڵەمێشی خۆیەوە سەرهەڵدەداتەوە.

# خاتوو ئیلعازر

دیسان ئەم کارەم کردەوە

دە ساڵ جارێک

من وا دەکەم

ئیعجازێکی نەسرەوتووە

پێستم بە چەشنی شەوچرای نازییەکان دەدرەوشێتەوە

لاقی راستم

پارسەنگێکە لەسەر کاغەزی دادەنێن

روخساریشم بێ رواڵەتە

وەکوو کەتانی ناسکی یەهوودییەکان.

ئەی دژی من

رووبەند لە روخسارم لادە

ئەرێ ئەمن ترسێنەرم؟

لووت، قوڵکەی چاو

ریزی هەموو ددانەکان؟

تامی تفت و تاڵی ناو زار
گشت بە ڕۆژێک لەناو دەچێ

ئەو گۆشتانەی لە خاکی گۆڕ دا پوابوون
دیسانەوە دەڕوێنەوە و
من دەبمەوە ژنێکی دەم بە پێکەنین
تەمەنم تەنیا سی ساڵە و
وەک پشیلەش
نۆ رووحم لە گیاندا هەیە.

ئەوە جاری سێهەمینە
چ نەدامەتی‌یەکی رەشە
بە هەر دە ساڵ جارێک مردن.

بە ملوێنان بەند و دەمار
حەشیمەت توو دەترووکێنن و هێرش دێنن
تا ببینن
چۆن رووت دەبنەوە
دەست و پێم
ئیستریپتیزی مەزن.

خوشکان، برایان

ئەوە دەستەکانی منە

ئەوە ئەژنۆکانی منە

هەر پێست و ئێسکێکە و چی تر

بەڵام من هەر هەمان ژنم، هەمان!

یەکەم جار کە وام بەسەر هات دە ساڵان بووم

ڕێکەوتێکی کوتوپڕ بوو...

جاری دووەم ویستم کارەکە تەواو کەم

بە چەشنی گوێچکە ماسییەک

دەرکم لە سەر خۆم گاڵەدا

ناچار بوون دەرگاکەم بکوتن

کرمەکان وەک مرواری لیچق لە گیانم بێننە دەرێ

مردنیش وەک زۆر شتی دیکە هونەرە و

منیش

زۆری لێ شارەزام

زۆر شەیتانانەی دەزانم

وای دەزانم لە راست بچێ
رەنگە پێت وابێ لە غەیبەوە پێم دەڵێن.

لە بەندیخانە دەتوانی بە سانایی راپەڕێنی
بە سانایی راپەڕێنی و هەر لەوێ بمێنیەوە
شتێکە هەر وەکوو شانۆ
کە بە رۆژی رووناک بگەڕێیەوە
راست بۆوێ بگەڕێیەوە
هەر بەو روخسارەشەوە
بەو هاوارە مندالانە رەمەکی‌یەوە:

ئیعجازە ئەمە
ئەوە ئەو هاوارەیە هێنامی‌یە هۆش.

بۆ دیتنی برینەکانم دەبێ پوول بدەن
بۆ بیستنی ترپەی دڵم دەبێ پوول بدەن
کورە خۆ دڵم لێ دەدا.

بۆ بیستنی قسەیەک، دەست پێداهێنانێک، دڵۆپە خوێنێک
چڵە قژێک یان کوتێک لە جلەکانم

دەبێ پووڵ بدەن، پووڵێکی زۆر

دەی زۆر باشە کاکی دکتۆر
کاکی دوژمن
من هەموو سامانی ئێوەم
منداڵێکم لە زێڕی رووت
کە لە ناڵەیەکدا دەتوێتەوە
دەسووڕێمەوە و دەسووتێم
پێت وانەبێ چاوەدێرییەکانتم لە بەر چاو نییە.

خۆڵەمێش، خۆڵەمێش
بۆخۆتان تێکەڵی دەن، بیگەڕێن
نە گۆشت، نە ئێسک، هیچ شتێک لێرە نییە

قالبێک سابوون
ئاڵقەیەکی بووکێنی
ددانێکی زێڕ

بەڕێز رەحمان
خاوەن شکۆ شەیتان

بزانن و ئاگادار بن
بزانن و ئاگادار بن

لە دڵی خوڵەمێشەوە
بەقژی سوور دەردەکەوم و
وەکوو هەوا
گشت پیاوەکان هەڵدەلووشم.

# تێپەڕین لە ئاو

گۆلی ڕەش، بەلەمی ڕەش، دوو مرۆڤی کاغەزی ڕەش
بۆ کوێ دەچن ئەو دارە ڕەشانەی لێرە ئاو دەخۆنەوە؟
سێبەرەکانیان دەبێ کاناداش داپۆشێ.

تۆزقاڵێک نوور لە نێو گوڵەکانی ئاوەوە دەبریسکێتەوە
گەڵاکانیان نایانهەوێ پەلە بکەین
خڕ و تەختن و پڕن لە ئامۆژگاری ڕەش.

جیهانە ساردەکان بە زەبری سەوڵ دەکەونە لەرزین.
رووحی تاریکیی لە ئێمە دایە، لە ماسییەکاندا
ڕەوەزێک بۆ ماڵئاوایی دەستێکی بێڕەنگی هەڵێناوە.

ئەستێرەکان لە نێو نیلووفەڕەکاندا دەپشکوێن
ئەرێ تۆ کوێر نابێ لە دەست پەری ئاوا بێدەنگ؟
ئەوە بێدەنگی رووحە ترساوەکانە.

سەرچاوە:

١-موحد، ضیاء(١٣٧٧)، شعر و شناخت، تهران، انتشارات مروارید

٢- پلات،سیلویا(١٣٨٤)در کسوت ماه، ترجمه سعید سعیدپور، تهران: نشر مروارید

ئیمیلی دیکنسۆن لە کۆڕ و کۆبوونەوە ئەدەبییەکانی ئێراندا ناوێکی ناسراوە. لێر و لەوێ نووسراوە گەلێکی زۆر لەمەڕ شێوە و شێوازی هونەری ئەو شاعیرە وێڕای کۆپلە شێعر و نامەکانی بڵاو کراوەتەوە و هۆگری و سەرنجی لایەنگرانی شێعر و ئەدەبی بۆ لای خۆی راکێشاوە. ئیتر کاتی ئەوە هاتووەوە ئەو شاعیرە مەزنە بە شێوەیەکی باشتر بە کۆمەڵانی ئەدەبی بناسێندرێ. لەبەر ئەوەی کە رادەی ناسیاوی ئێمە سەبارەت بەو شاعیرە لەچاو بارستای قورسی شێعرەکانی لە لایەک و شوێن دانانە سەرنجراکێشەکەی لە سەر شێعری مودێڕن لە لایەکی دیکەوە یەکجار کەم و بەرتەسکە.

"ئیمیلی"یان بە "شاعیری شاعیران"، "مەزنترین ژنە شاعیر"، " یەکێک لە گەورەترین شاعیرانی ئامریکا"، "پێشەنگی شاعیرانی نوێخواز" و " شاعیری شتە سەرسوورهێنەرەکان"،... ناودێر کردووە. رەنگە ئەو زیاتر لە هەر شاعیرێکی تر بووبێتە هۆی سەرسووڕمان و مایەی تاریف و پێداهەڵدان و تەنانەت سەرلێشێواوی شاعیرانی پاش خۆی و شوێنەوارەکانی باسوخواسێکی زۆری ورووژاندبێت و بە تەسەلی لێکدرابێتەوە و کەوتبێتە بەر تیشکی رەخنە و شرۆڤەوە. تا ئێستا سەدان کۆمەڵە شێعر و چەپکە شێعری لێ چاپکراون و سەدان وتار و کتێب لەمەڕ ژیان و شێوازی شێعری ئەو نووسراوە. شاعیرانی نوێخوازی وەک "تێد هیوز"، "سیلویا پلات "، "ریچارد ویلبێر" و "ئارچیباڵد مەکلیش" ستایشیان کردووە. بەڵام بە

راستی ئەو شاعیرە كێیە و [چ شێوە نووسینێكی ڕەچاو كردووە، كە تا ئەو ڕادەیە بووەتە هەوێنی نووسین و باس‌وخواسی نووسەران و توێژەران]؟

نووسین سەبارەت بە وەها كەسایەتی‌یەک چەتوونە، چون ژیانی تاكەكەسی ئەو، هەوراز و نشێوێكی وای تێدا بەدی ناكرێ. بۆ ناسینی ئەو دەبێ بچیە ناو هەرێمی دەروون و قوژبنە نەبەدی‌یەكانی رووح و دیمەنە شاراوەكانەوە. ساڵی ١٨٣٠ لە شارۆچكەی "ئیمهێرست" لە ئەیالەتی "ماساچۆسێتی" ئامریكا لە دایک بوو و ساڵی ١٨٨٦ هەر لەو شارە و هەر لەو ماڵەشدا كە چاوی بە رووی دونیا دا هەڵێنابوو كۆچی‌دوایی كرد. بابی ئیمیلی بەرپرسی بەشی ماڵی زانكۆ و مرۆڤێكی مەزهەبی و كەللە ویشک، بەڵام خاوەنی دڵێكی پاک و لە هەمان كاتدا ترسێنەر بوو. ئیمیلی بە هەڵكەوت لە ماڵ دەچووە دەرێ و بە هەڵكەوتیش شار و دیاری خۆی بە جێ‌دەهێشت. هەرگیز مێردی نەكرد و ژیانی خۆی بە شێعر وتن و ئاگاداری لە ماڵ و دایک و بابی ڕادەبوارد. پاش مەرگی دایک و بابی ئیتر بە یەكجاری گۆشەنشین بوو، تەنانەت لەگەڵ خزم و كەس‌وكاریشی هەر بە نامە و نووسراوە پێوەندی دەگرت. لە تەمەنی سی ساڵی‌دا شەیدای پیاوێک بە ناوی "چارڵز وێد زۆرس" بوو، ئەو پیاوە كە پیشەی دادوەری دادگا بوو، ناسیاوی بنەماڵەكەیان بوو. سەرەتا "زۆرس" زۆری سەرنجی ئیمیلی ڕاكێشا، بەڵام ساڵێک دواتر بە بیانووی ڕاگوێزرانی پیشە ئیداری‌یەكەی بۆ "كالیفۆرنیا" شاعیری سەوداسەری بەجێ‌هێشت. ناكامی لەو عیشقەدا بووە هۆی ئەوەی ئیمیلی یەكجار پەرێشان و هیوابڕاو بێ. وێدەچێ هەر لەو سەردەمەدا بێ كە

داهێنانی ئەو دەگاتە ئەوپەڕی خۆی و ئیمیلیش پاش ئەو ڕێکەوتە بۆ هەمیشە جلی سپی لەبەر دەکا و لەماڵ وەدەرناکەوێ.

زۆر جار بەستە شیعرێکی ویڕای لقێک گوڵ یان کورتە نامەیەک بۆ خزم و دۆستانی دەنارد. هاوشاریەکانی زیاتر ئەویان بە ژنێکی سەیر و سەرنجڕاکێش دەزانی، نەک بە شاعیرێکی لێهاتوو و نازناوی "ئوستوورە"، "ژنی سپیپۆش" و "شاژنی گۆشەنشینان"یان پێدابوو. سەرەڕای ئەوەش لەو هەمووە نامەیەڕا کە لە پاش ئیمیلی بەجێماوە دەردەکەوێ کە گۆشەگیری و تەنیابوونی ئەو هەرگیز بە مانای بێزاری و دووری لە خزم و کەسوکاری نەبووە، چونکە نامەکانی پڕن لە عەشق و خۆشەویستی و پێوەندی نزیک و بەرامبەر و دوولایەنە. لە ساڵی ١٨٦٢دا پێوەندی نووسینی لەگەڵ "تامس هیگنسۆن" سەرنووسەری مانگنامەی "ئاتلانتیک" دەست پێکرد. ئەو پێوەندییە تا کۆتایی تەمەنی ئیمیلی بەردەوام بوو. تەنیا جارێک لەماڵی ئیمیلی دیدارێک لە نێوانیاندا پێکهات...

هیگنسۆن لە جوانکاری و توانای شێعری ئیمیلی دەگەیشت، بەڵام چون بە شێعری چوارچێوەدار، قالبی و باو ڕاهاتبوو؛ داهێنان و نوێکردنەوەی دلێرانە و بوێرانەی ئیمیلی لە بابەت کێش و سەروا و وێنەسازی و ئیهام و ... وە پێ قووت نەدەچوو و لەسەر ئەو رایە بوو ئیمیلی هێشتا لەو بابەتانەدا دەستەوەستانە و پێنەگەیوە. هیگنسۆن لە شوێنێکدا دەڵێ: شێعری ئیمیلی وەک گیایەک وایە کە لە ریشەوە هەڵکەنراوە، بەڵام هێشتا خۆڵ و شەونم و بارانی پێوەیە. وێڕای ئەوانە

سەرنووسەر رادەسپێرێ تا ماوەیەک دەست راگرێ و چاوپۆشی بکا لە چاپی شێعرەکانی، بەڵکوو بتوانێ شێعرەکانی رەوانتر و نیانتر بن و باری مووسیقاییان باشتر بێ و تەکووزیەکی زیاتریان بداتێ. ئیمیلیش وادیارە ئەو داخوازییەی هەر لاپ بە دڵ بووە. ئامۆژگارییەکەی لێ وەردەگرێ و هەتا ئەو رۆژەی دەیبەنە گویێ قەبری لێی لانادا. بەڵام هۆی خۆپاراستنی ئەو لە چاپی نووسراوەکانی، ئەوە بوو کە هەر لەبنەڕەتدا، پێی وا بوو لەچاپدان؛ یانی هەڕاجکردنی بیر و زەینی مرۆڤ. مەبەستی ئیمیلی لە هەڵبەستنی پردی پێوەندی لە گەڵ سەرنووسەر کەڵکوەرگرتن لە رەخنەکانی ئەو بوو کە سەبارەت بە هۆنراوەکانی نووسیبووی، نەک لەچاپدان و بڵاوکردنەوەیان. بە گوتەیەکی تر ئیمیلی هیچ سەرنجی نەدەدایە راسپاردەکانی مامۆستا لە بابەت چاککردنەوەی کێش و سەروای شێعرەکانی. ئەو پێداچوونەوەی بە نەشتەرگەری دەزانی.

پاش مردنی ئیمیلی؛ لاوێنیای خوشکی پاکەتێکی پڕ لە هۆنراوەکانی ئیمیلی دۆزییەوە، کە زیاتر لە ١٧٠٥ کۆپلە شێعر بوون. شێعرەکان لەسەر کاغەزی جۆراوجۆر نووسرابوون و پێکەوە دووروابوون. هەوەڵ چەپکە شێعری ئیمیلی لە ساڵی ١٨٩٠ بە یارمەتی" تامس هینگسۆن " و پاش پێداچوونەوەی ئەو لە چاپ درا و پاشان دەیان جار چاپ کراوە. تا ساڵی ١٩٥٠ شێعری ئیمیلی بە چەندین پێداچوونەوەی نوێوە هاتە بازاڕەوە و پێشوازییەکی بەرچاوی لێکرا. بەتایبەت لە ساڵی ١٩٢٠ بە دوا بەشێکی زۆر لە نوێخوازەکان رەسەنایەتی و داهێنانی شێعری ئەویان رەچاو کرد. لە

ساڵی ١٩٥٥ "تامس جانسۆن" لە "زانکۆی هاڕوارد" تێکڕای شێعرەکانی ئیمیلی لە توێی سێ بەرگی جیادا کۆکردەوە. کارەکەی جانسۆن لە دوو سەرەوە گرینگ و بەرچاو بوو یەکەم ئەوەی کە: هەموو هۆنراوەکانی ئیمیلی بە شێوەی زەمانی بەرودوا (لە ژومارە ١ تا ١٧٧٦) لە کۆمەڵێکدا کۆکردەوە. دووهەم: دەستنووسە سەرەکییەکانی کردە بنەما و تێکستی شێعرەکانی ئیمیلی لە نەشتەرگەری و دەستتێوەردان رزگار کرد. بەو جۆرە بۆ یەکەم جار داهێنانەکانی ئەو شاعیرە لە بواری کێش و مووسیقا و سەروا و رۆچوونە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەو لە تانوپۆی لێکتەنراوی پارادۆکسیکاڵی زمان و زەماندا کەوتە بەر دەست و سەرنجی خەڵکی جیهان.

سەیر ئەوەیە کە ئیمیلی بەدرێژایی پێوەندی خۆی لەگەڵ "هیگنسۆن" ئەوی بە مامۆستای خۆی دەزانی. هەرچەند زۆر زیرەکانە تەفرەی دەدا و لە ژێر باری وڵامدانەوەی پرسیارە تایبەتی و تاکەکەسییەکانی ئەو دەرباز دەبوو. بۆ وێنە جارێک کە ناوبراو لە تەمەنی ئیمیلی دەپرسێ؛ لە وڵامدا دەنووسێ: "کاکی برا تا ئەو زستانە هیچ شێعرێکم نەنووسیوە، جگە لە یەک دووانێک، کە هەڵبەت ئەوانیش راست نین ". یان کاتێک "هێگنسۆن" داوی لێدەکا وێنەی خۆی بۆ بنێرێ ئیمیلی دەنووسێ: " بە بێ وێنەش پەسەندم دەکەن؟ دەکرێ بڵێم من وەک پاسارییەکی بچووکم بەقژی سوور و فرەوە کە لە درووەکانی دار بەڕوو دەچێ، چاوەکانیشم لە خڵتەی شەڕابی نێو جامی میوان دەکا. ئاخۆ ئەو قسانە کاری وێنەیەک ناکەن؟" لە نامەیەکدا

بۆچوونی خۆی لەبابەت ناوبانگەوە ئاوا دەردەبڕێ: بە پێشنیاری ئێوە سەبارەت بەوەی کە لە چاپی شێعرەکانمدا پەلە نەکەم پێکەنینم دێ. بیری لە چاپدان ئەوەندە لە زەینی من دوورە، وەک سنووری نێوان تاریکی و نوورە. ئەگەر ناوبانگ هی من بێ، لەدەستی رزگار نابم و ئەگەر هی منیش نەبێ، هەرچەندی بەشوێندا وێڵ بم دەستم پێی راناگا و تەنانەت سەگەکەشم رووم لێ وەردەگێڕێ. بۆ من هەر ئەو پێخاوسی و رووتەڵەیییە باشترە و هەر ئەوەشم لێدەکاڵێتەوە.

## پێشەنگی شێعری مودێڕن:

هەرکەس کەلام و وێژەی ئیمیلی دیکنسۆن بناسێ ئەوەندە نزیکایەتی لە نێوان خۆی و ئەودا هەست پێدەکا کە هەر بە ناوی چکۆلە بانگی بێڵێ. چونکە ئەو شاعیرە بە راوێژ و دەنگی تایبەتی لەگەڵ خوێنەری خۆی لە شاراوەترین ئەزموونە هاوبەشەکانی مرۆڤ دەدوێ؛ باسی ئەوین، دڕدۆنگی، مەرگ، خودا، سروشت و هەرمان و ... دەکا. ئەو ژنە خۆی لە گۆشەی ماڵە بابدا زیندانی کردبوو، چونکە لەوێ کاکەشانێکی لە ئەزموونە دەروونییەکان دەدیتەوە. ئەو بە ناخی ژیاندا سەفەری دەکرد نەک لە پانتای زەویدا. لە خۆڕا نەبوو کە هۆنراوە درەوشاوەکانی پێشمەرگی لە مجرییەکدا دیترانەوە.

لە قووڵایی رەنج و ناهومێدیدا، هیچ نیشانێک لە لاواندنەوەی و دڵدانەوەی خۆی، لە راوێژ و بێژەیدا نابیندرێ، بەڵکوو گەشاوەیی و

روانگەی هەرەبەرزی وێڕای تەمێکی تەنزاوی تێدا بەدی دەکرێ. هونەری ئەو شێعرێکی مەرگ...ئەندێشە؛ هەر چەندە ئەویش وەک "دەبلیو. ب. یەیتس" شاعێری ئیرلەندی پاش خۆی، تێگەیشتبوو کە ژیان تراژیدیایە. بەڵام ئەگەر ژیانی شاعیران تراژیک بێ، ئیتر وەک شاعێرانی تەریک و لەبیرکراو باسیان لێدەکرێ.

چاوی شاعیر دەبێ گەش و شاد بێ، هەر راست بەوێنەی چاوی ئیمیلی، بە رەنگی پاشماوەی شەڕاب لە جامی بلورینی میواندا. بە وتەی "مەکلیش" شاعیری ئامریکایی ئێمە راهاتووین ئەو شێعرانە بخوێنینەوە کە خوێندنەوەیان وەک ئەوە وایە کە مرۆڤ بە دزییەوە سرتەی شاعیر لەگەڵ خۆی ببیستێ. بەڵام دەنگی ئیمیلی ئەوەندە پڕ لە دڵەڕاوکێ و تیژ و تایبەتی خۆیەتی، کە خوێنەر وا لێدەکات هەتا ئاخری گوێی بۆ رادێرێ. سەیر ئەوەیە کە ئەو دەنگە زیندوو و سیحراوییەی لە مجرییەکدا شاردبۆوە ... ئیمیلی وێڕای هەر "من"ێکی زیندوو وەها بە ئاشکرایی لە نەگوتراوەکان دەدوێ کە مرۆڤ گەی بە گەی لەشی خۆی لە وشەی ئەودا دەبینێتەوە ...

لە راستیدا شێعری ئیمیلی دیکنسۆن پەیامی نییە؛ بەڵکوو خودی ئەزموونەکان بە شێوەی ناسیارییەکی نوێ دەدەڵێنێتە دەرێ. نهێنی هونەری ئەو لەوە دایە کە ئەگەر بکرێ جیهانی ئەزموونیی راستەوخۆ داگیر بکەی، بێجووڵە رایبگری، بەدیکراو و هەستپێکراوی بکەی، ئەوسا وەک خودی خۆی مانای دەبێ. رەنگە مەبەستی "شارڵ بوودلێر" لە وێکچوونە گشتییەکان هەر ئەوە بووبێت. جیهان دەتوانێ بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە

پێوەندی نێوان بەشە جوداکانیدا مانا بە خۆوە بگرێ. ئیمیلی هەموو دیاردەکان لە رکەی فۆرم و وێنەدا یەخسیر دەکا و دەیرێژێتە چوارچێوە و قالبی شێعرەوە. شێعرەکانی لێورێژی مانان؛ چونکە روخساری جیهان لە ناخی پێوەندی شتە جۆراوجۆرەکاندا رادەگرێ؛ ئەوەش کارێکە کە هەر شێعر لە دەستی دێ. ئەو جلکی شێعر لە بەر ئەزموونەکان دەکا تا بیانکاتە راستەقینە و ئەم بە راستەقینەکردنە، جاری وایە بوێرییەکی زۆر دەخوازێ، زۆربەی شێعرەکانی ئیمیلی لە باری بوێرییەوە بێهاوتان و شێعری کەس ناتوانێ شان لە شانیان بدا، بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە شێعر گەلێکی وەک: "روخساری رەنجم خۆشدەوێ"، "رێورەسمی ناشتنێکم هەستپێکرد لە مێشکمدا"،"ویزە ویزی مێش" و "ئەوکاتەی لە گیانەڵلا دابووم" بکەین. ئاخۆ دەبێ بۆ هۆنینەوەی شێعری لەو بابەتە، شاعیر چەندە لە خەم و ژان و مەراقی خۆی دوور کەوتبێتەوە و ئەوانەی بە شێوەی راستییەکی بەرچاو، دیتبێ؟ هەر لەبەر ئەو تایبەتمەندییەشە کە شێعرەکانی پڕن لە ئیهام و دژوازی، دەستەواژە و تەعبیری وەک "لوتفی ماڵوێرانکەر" و "مەزنیی خوێڕی".

"ئارچیباڵد مەکلیش" ئیمیلی بە شاعێری جیهانی تایبەتی ناودێر دەکا و دەڵێ: هۆنەرێکی ئاوا تەنیا ناڕوانێ، بەڵکوو دەبێتە ئەکتەری ئەو پانتایەی تێی دەڕوانێ. وتەبێژی شێعرەکانی، دەنگی خۆیەتی لە رۆڵی ئەکتەردا، دەنگی خۆیەتی لە رۆڵی شاعیردا. وتەکانی پێکهاتەیەکی دوولایەنەی وەک دەنگ و مانایان هەیە. ئەوپەڕی توانایی شێعری و عاشقانە نووسینی ئەو لەوەدایە کە

دەنگ و مانا تێکەڵاون. دەنگ مانایە و ماناش دەنگە. وێنە دووورە زەینەکان بەدی دەکرێن و بەدیکراوەکان دوورە زەین دەنوێنن. بە پشت بەستن بەو راوێژ و دەنگە تایبەتەیە کە شاعیر دەوێرێ دەیان شێعر بۆ پێناسە و باسی شتە جۆراوجۆرەکان بنووسێ، کە دەڵێی لە زەینی شاعیردا دەدرەوشێن:. هیوا زگەڕۆیەکی نەبەزە. یان: "پەژیوانی بیرێکە وشیار و دەستوپێوەندەکانی سەرقاڵ و نالەبار". کێ بە قەت ئیمیلی بوێری پێناسەی بابەتێکی لە شێعردا هەیە. یان دلێری هۆنینەوەی شێعر گەلێک کە بە وشەی "من" دەست پێدەکا؟ وڵام ئەوەیە کە لە راستیدا ئیمیلی گوێڕایەڵی قسەوباسی رەخنەگران و لێکۆڵەرە ئەدەبییەکان نەبوو؛ تەنانەت یەخسیری مۆد و دابی شێعر و شاعیریش نەبوو. هونەرمەندێک بوو کە درەوشانەوەی هەستی بەرزی خۆی بە لێهاتوویییەکی بەربڵاوەوە لە ئاهەنگ و کەلامێکی سیحراویدا دەردەبڕی. هەڵبەت بەرەکانی پاش خۆی ئەو جوانییە سێحراوییەی هۆنراوەکانی ئەویان ناسی و پاش مەرگیشی نیو سەدەی پێچوو تا جێگەوپێگەی بەرزی خۆی لە شێعر و ئەدەبدا پتەو کرد. ئەوە نیشاندەری ئەو راستییەیە کە ئەو تا چەندە وەپێش زەمانی خۆی کەوتووە و بە تەنیا لە گۆشەنشینیدا پانتاییە تازەکانی شێعری دۆزیوەتەوە.

بە گوتەی "ئێزراپاوند" و بە تەعبیری "بیژەنی ئیلاهی" ئەدەب هەواڵێکی گەرمە و هەر بە و گەرمییەش دەمێنێتەوە و ئەوەش بە ڕاستی نهێنی مانەوەی ئیمیلییە. هەواڵی شێعرەکانی ئەو نە تەنیا گەرمە، بەڵکوو بە

شێوەیەکی بەرەوپێش بەردەوام گەرمتر بووە و دەبێ. لە خۆڕا نییە کە بۆ خۆی دەڵێ تەنیا هەواڵێکی کە هەموو ڕۆژێ دەیبیستم هەر هەواڵی هەرمانە.

زۆربەی ڕەخنەگرانی ئەدەب دیکنسۆن بە پێشەنگی وشیاری و ئەزموونگەری مودێرنیستی دەزانن. بۆ وێنە "کێنێت ئێستاکس" لە کتێبی "ئیمیلی دیکنسۆن و وشیاری مودێڕن"دا ئەوی لە ڕیزەی نوێخوازانێکی وەک "بوودلێر" تا سووریالیستە فەڕانسەوییەکان، یان لە ڕیزەی "هاپکینز" تا "ئێلیوت" لە ناو شاعیرە ئینگلیسی زمانەکاندا لە قەڵەم داوە. تەنانەت لە هەڵسەنگاندن لە گەڵ "جێرارد مێنلیهاپکینز" شاعیری هاوچەرخی ئیمیلی، ئیمیلی بە مەزنتر دادەنێ. چونکە هەرچەند "هاپکینز" لە پانتای ڕێزمان و ئاهەنگ و وێنەسازیدا ئەزموونگەلێکی درەوشاوەی هەیە، بەڵام بە هۆی ڕەگوریشەی نەریتی کاتۆلیکی زەینی خۆی، ڕوانگەی هەمەلایەنەی ئەوی نییە. ئیمیلی ڕاستەوخۆ و بێ هیچ پێشئاگایییەکی مەزهەبی لە گەڵ خودی قەیرانی مرۆڤ و بۆشایی بایخەکان بەرەوڕوو بۆوە.

بەڵام چلۆن دەکرێ ژنێکی گۆشەگیر لە کوێرەدێیەک و دوور لە کۆبوونەوە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکان ببێتە پێشەنگی نوێخوازی و سەرقافڵەی شێعری نوێ؟ "گۆتە" سەبارەت بە جەوهەری شاعیرانە دەڵێ: شاعیری ڕاستەقینە لەزاتی خۆیدا جیهان دەناسێ و بۆ خۆیاکردنەوەی ڕاستییەکان چاونزێری ئەزموون یان دیتنی شتە جۆراوجۆرەکان نییە. ئەوەش هەر ئەو ڕاستییەیە کە ئیمیلی لە یەکێک لە شێعرەکانیدا دەیهۆنێتەوە:

"هەرگیز زەوی‌یەکی بەیارم نەدیوە... "

لێرەدا دەزانین کە شاعیر نە تەنیا لەگەڵ دیاردە جیهانی‌یەکان بەڵکوو لەگەڵ هەرێمی مەعنەوی و خوداییش ئاشنایە. خاڵی جێی سەرنج ئەوەیە، کە شێعر پێوەندی بەو ئاستانەی راستەقینەوە هەیە کە بنەمای جیهانی هەستپێکراوی ئەزموونەکانی رۆژانەی پێکهێناوە، بەڵام دیار و بەرچاو نییە.

بۆ وێنە شێعری "درەوشانەوەی نوورێک هەیە" جوغرافیای ناهومێدی و لێکدابڕان٠بە شێوەی دیمەنێکی هەستپێکراو دەنەخشێنێ. هەڵوێستی شێعر لە جیهانی دەروونی مانا و پێوەندی‌یەکان دایە؛ پانتایی‌یەک کە "گۆتە" بە هەرێمی سەرەکی شاعیری دادەنێ. لێکبەستنی ئەندێشەی دوورە زەین لە گەڵ وێنەی دیار و ناسراو، تایبەتمەندی بەرچاو و خاڵی بەهێزی بەرهەمەکانی دیکنسۆنە. ئەو لێکبەستنە بە هۆی توانایی ئەو لە وەکارهێنانی سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی زمان دێتە ئاراوە، شێوە شێعرێک کە وەبیرهێنەرەوەی شێعرەکانی بەر لە سەدەی حەڤدە، بە تایبەت شێعری "میتافیزیکاڵ"ەکانە؛ یانی ئەو کاتەی کە هێشتا "لێکپچڕانی هەست "رووی نەدابوو و بە وتەی ئیلیوت ئەندێشە و هەست لێک نەترازابوون.

کەلامی رەوان و پڕ لە دۆزینەوەی دەروونیی ئیمیلی بۆتە هۆی ئەوەی کە بەشێکی زۆر لە رستە و تەعبیرەکانی لە یادەکاندا بمێنێتەوە و ببێتە زاراوە و رستەگەلێکی کورت سەبارەت بە ئەزموونە قووڵەکانی مرۆڤ، بۆ

وێنە "لێکدابڕان تەنیا شتێکە کە سەبارەت بە بەهەشت دەیزانین و هەموو ئەو شتەشە کە لە دۆزەخمان دەوێ. " یان "من هیچ کەسم، ئەی ئەتۆ کێی؟

ئیمیلی لە بەشێک لە شێعرەکانیدا بە شێوەی مودێڕنیست گەلێکی وەک "ژۆزێف کۆنراد" بێترس دەڕوانێتە "دڵی تاریکی". بۆ وێنە لە چەند بەستە شێعری وەک "رووح دەست بە تۆ دادێنێ"، "مەرگ نەبوو" و... ئەویش وەک "ئاودێن" شاعیری ئینگلیسی سەدەی بیست دەیزانی کە ترسێنەرترین کێشەی شاعیر؛ روانینە لە دۆڵە تەم و مژاوییەکانی ناخ و دەروون. هەر ئەو بابەتە لە شێعری "گێژەن و ئاسمانێک بەسەرەوە "دا بە روونی دەردەبڕێ.

لە روانگەی "ئیلیووت"ەوە ئەویندارانە نووسین، زایەڵەی دەنگی شاعیرە لەو کاتەدا کە لەگەڵ خۆی دەدوێ. هەندێک لە هۆنراوەکانی دیکنسۆن راست وەدیهاتنی ئەو بابەتە روون دەکەنەوە. بە تایبەت "بە بێ ئەو تەنیایییە /رەنگە تەنیاتر بم" و "دەفتەری تەمەنم بەر لە کۆتایی دووجار بەسترا". لەو بابەتەوە شێعری ئیمیلی ئەویندارانە دوانە لە مەڕ کارەساتێکەوە کە بنەمایەکی راستەقینەی هەیە، بۆ وێنە زۆربەی عاشقانەکانی ئیمیلی سەردوولکەی ئەوینە ناکامەکەیەتی.

ئیگزیستانسیالیزم هەرچەند شۆڕشێکی فەلسەفی سەدەی بیستەمە؛ بەڵام ریشەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەندێشەکانی "سۆرۆن کیێرکێ گوور"، و لە مەعریفەی ئیمیلییشدا بابەتی وەک ئەو ئەندێشەیە شوێنێکی زۆر بەرچاوی هەیە. ئیمیلی ئەو شتەی کەوا بە شێوەیەکی شاراوە بوونی هەبوو، لە شێعردا ئاگایانە دەریبڕی. لە هێندێک لە هۆنراوەکانیدا تێگەیشتنێکی قووڵ لە باسە

ئیگزستانسیالیستی‌یەکان وەبەرچاو دەکەوێ. باسی وا کە لەودا مرۆڤ لە قالبی بوونی زاتی و رەسەنی خۆیدا نەهاتۆتە بەرباس ، بەڵکوو بە شێوەیەک رووخاوە، دابڕاوە، بە شێوەیەکی نامۆ وێنا کراوە، کە دەبێ لە نیزامی سروشتی و کۆمەڵایەتی‌دا، بە یارمەتی ویست و بایخە دەروونی‌یەکانی خۆی، بوونی خۆی خۆیا بکاتەوە و ماناکانی خۆی لە بۆشایی ئاکاری و فەلسەفی‌دا بخوڵقێنێ.

هێندێک لە بەستە شێعرەکانی ئیمیلی دەربڕی angst یان دڵەراوکێی هەبوونی ئیگزستانسیالیستی‌یە. بە تایبەت لەو شوێنانەدا کە لەگەڵ توخمەکانی سروشتیش هەست بە نامۆیی دەکا. بۆ وێنە کۆپلەی " زوو وەڕێکەوتم" کە بوێژەکەی لە ترسی دەریا پەنا دەباتە بەر شارە ویشک و قاقڕەکەی خۆی. وەکی دەردەکەوێ سروشت بۆ ئیمیلی لەگەڵ سروشتی دڵڕفێن و کارتێکەری رۆمانتیک و بەرزەخوازەکان زۆر جیاوازە.

"لووسین گوڵدمەن"، "جۆرج لۆکاچ"ی نووسەری کتێبی "گیان و دیمەنەکان"، بەر لە هایدگێر بە بناغەدانەری راستەقینەی ئیگزستانسیالیست دەزانێ. لۆکاچ لەو کتێبەدا دەڵێ: راستەقینەی هەبوون تەنیا لە ژێر تیشکی ئەزموونێکی بەهێزی زەینی و لە سایەی ئاگادار بوون لە بەرتەسکی ژیان...کە مردن بە راستی‌یەکی هەمیشە ئامادە و ئەزەلی و هەرماو دەناسێ... مسۆگەر دەبێ. مەرگ کە بۆ خۆی ئەوپەڕی بەرتەسکی‌یە، راستیەقینەی هەرماوی ژیان بەدی دێنێ. بە تێگەیشتن لە بەرتەسکی هەستی‌یە کە رووح دەگاتە وشیاری...هەیە چونکە بەرتەسکە و وێڕای

ئەوەش لەو پانتا بەرتەسکەشدا هەیە... جۆرج لۆکاچ ئەو مەعریفەیە ئاوا تاوتوێ دەکا "نوورێک کە لە ناکاو رووناک دادەگەڕێ" وەک برووسکەیەک بەسەر لاڕێبوون دا ". وێنەی ئەم بیرە لەو شێعرەی ئیمیلیدا دەبیندرێ:

دوورترین گرمەهەورێک کە بیستم
لە ئاسمان نزیکتر بوو.
ئێستاش هەروا دەگرمێنێ هەرچەند نیوەڕۆ گەرمەکان
گوللەکانیان بەسەرمدا دەبارێنن
برووسکەیەک کە بەر لەو هات
جگە لە خۆم کەسی نەسووتاند.
بەڵام من ئەو برووسکەیە
ناگۆڕمەوە بە گشت تەمەن.

# ئەمن هیچ کەسم ئەتۆ کێی؟

ئەمن هیچ کەسم ئەتۆ کێی؟
ئەرێ ئەتۆش هەر هیچ کەسی
کەوابوو ئێمە جووتێکین
ئەوە لای کەس مەدرکێنە
نەبادا ریسوامان بکەن.

چەندە ناخۆشە کەسێک بوون
چ شوورەیی‌یە وەکوو بۆق
بە درێژایی تەمەنی سەوزی بەهار
ناوی خۆت بڵێیەوە
بە گوێی گۆلاوێکی شایەردا ...

# گەر بڕیار با پاییز هاتبای

گەر بڕیار با پاییز هاتبای
من هاوینم وەلا دەنا
بە بزە و دەست راوەشاندن.
وەک خاتوونێک
مێشێک لە خۆی هەڵفڕێنێ

گەر دەمتوانی ساڵێکی تر بتبینمەوە
مانگەکانم رێکدەکوشی و
گلۆڵەم دەکردن
هەرکامیانم دەخستە مجرییەکەوە
تا ژومارەیان رابگرم

ئەگەر تەنیا چەند سەدە درەنگ هاتبای
سەدەکانم بە قامکەکانم دەژماردن

پاشان لێکم کەمدەکردن

تا سەرەنجام

پەنجەم دەکەوتە دوورترین وڵاتەوە

گەر دڵنیا بام ئەوکاتەی دەمرم

ئەتۆش ڕەگەڵم دەکەوی

ڕووحم وەک توێژێکی زیادی

دەپچڕێیەوە و

بە خێرایی ئەبەدییەتم هەڵدەبژارد.

# ئەی ساتەکەی پڕ لە شکۆ

ئەی ساتەکەی پڕ لە شکۆ
هێدی بەوە
هەتاکوو تێر تەماشات کەم.
ئێستا کە پاراویم دیوە
تاقەتی تینوێتیم نییە.

ڕۆژێکی زۆر جیاوازە
ئەم بەیانە
بۆ ئەو کەسەی
کە بەرە و سێدارەی دەبەن.

# سووک و سانا

سووک و سانا

هەنگاوی نا شوێنی بەرزی

ئەستێرەی زەرد.

لای‌دا لەسەر روخساری پڕ لەنووری خۆی

مانگ

کڵاوە زێوینەکەی

سەرتاسەری شەو داگیرسا

وەک تەلارێکی ئاسمانی

رووم کردە ئاسمان و کوتم:

باوکی پیرۆزا!

چەند بە باشی کات و ساتەکان دەناسی.

# هەرگیز زەوییەکی بەیارم نەدیوە

هەرگیز زەوییەکی بەیارم نەدیوە
قەت لە دەریام نەڕوانیوە
بەڵام دەزانم بەیار وەکوو چی دەچێ و
شەپۆلیش دەبێ چلۆن بێ.

قەت لەگەڵ خودا نەدواوم
سەردانی بەهەشتیشم هەر نەکردووە
بەڵام هێندە
لەشوێنەکەی ئەرخەیانم
دەڵێی بۆخۆم نەخشەکەیم داڕشتووە.

# بە دوور لە پەنجەی بەربەیان

بە دوور لە پەنجەی بەربەیان
بە دوور لە پەنجەی نیوەڕۆ،
خەوتوون دانیشتوانی بە تابشتی هەستانەوە
هێمن، لە هۆدە مەڕمەڕینەکانیاندا
تەختەبەندیان لەحەریر و
سەربانەکانیان لە بەردن!

شنە لە کۆشکە هەتاویەکەیدا
بەهێوری بزەی دێتێ
مێشەنگوین
بە گوێچکەیەکی سووکدا دەچرپێنێ
باڵندە قشتیلەکانیش
ئاوازێک دەڵێن لە غەفڵەت

ئاخ.. چ حیکمەتێک لێرەدا وێران بووە.

لە هیلالی سەر ئەوانەوە
ساڵەکان بە شکۆوە تێدەپەڕن
جیهانەکان کووڕ دەبنەوە و
ئاسمانەکان هەموویان سەوڵ دەبزێون
نیوتاجەکان دادەکەون و
دادوەرانیش تەسلیم دەبن
بێدەنگ،
وەک خاڵێک لەسەر تەختی سپی بەفر.

# کاتێکم بۆ نەفرەت نەبوو

کاتێکم بۆ نەفرەت نەبوو

چونکە مەرگ بەربەستم بوو

تەمەنیش هێند درێژ نەبوو

تا بتوانم

کۆتایی بە کینە بێنم.

بۆ عەشقیش دەرفەتێک نەبوو

بەڵام لەوەی ڕا کە دەبێ، شتێک بکرێ

لە لام وابوو

کە ڕەنجی بچووکی عەشقێک

بۆ من بەسە.

# ئەگەر مردم

ئەگەر مردم

سوورە قورینگەکان کە هاتن

بە یادی من

لەتێک نان ببەخشە بەوەی

کە وا بۆین باخێکی سووری لە ملدا.

گەر لەخەوێکی شیرین و قورس دابووم و

نەمتوانی سوپاست کەم

بزانە حەولی بۆ دەدەم

بەو لێوانەی کە بوونەتە بەردی خارا.

# له ئێوارانی زستاندا

له ئێوارانی زستاندا
هەودایەک نوور بەدی دەکرێ
کە خنکان بەدیاری دێنێ
وەکوو کێشی ئاوازەکانی کلیسا

ژانێکی ئاسمانیمان پێ دەچێژێ
بێ ئەوەی بمان رووشێنێ
مەگەر جیاوازی‌یەک لە ناخدا
لەو شوێنەی واتاکان لەوێن

هیچ شتێک فێری کەس ناکا
ناهومێدی‌یەکی سەربەمۆر
عەزابێکی بەشکۆ کە لە ئاسمانەوە
بەسەر ئێمە دادەباری

ئەوساتە دێ دیمەنەکان گوێ رادەگرن
سێبەرەکان هەناسەکانیان رادەگرن
کاتێکش دەڕوا وەک وێنەی غەریبی‌یە
بە سەر روخساری مەرگەوە.

# دەنگی وەبارانە دەچوو

دەنگی وەبارانە دەچوو، تا چەمی‌یەوە
ئەوكات زانیم دەنگی بایە
بە كرداری تەڕی شەپۆل ڕێی دەپێوا
بەڵام كاتێ گەیشتە پێدەشتێكی دوور
بە كرداری وشكی لم هەنگاوی دەنا

هەنگامەی هاتنی سوپایەک دەبیسرا
ئەوەیان بەراست باران بوو
چاڵەكانی پڕ پڕكردن،
ئەستێرەكانیش كەلاوڕێژ
لە ڕێگە و بان كردییە هەرا
سەری لەسەر خڕ و دۆڵان هەڵدایەوە و
سێڵاوی لێ وەڕی خستن
زەوی‌یەكانی لێكهەڵبڕی و
دەریاكانی هێنایە جۆش

ناوەندی شارەکانی دەبزاوت و

لە پاشان وەکوو "ئیلیا"*

لە سەر چەرخی هەور سوار بوو

دوورکەوتەوە.

* لە کتێبی "پاشایان" بەشی حەڤدەهەم، ئایەتی یەکەم و بەشی هەژدەهەم ئایەتی ٤٤-٤٦دا نووسراوە کە بەئەمری "ئیلیای تەشبی" باران دایدەکرد. ئاماژەی ئەو شێعرە بۆ ئیلیا بەو بۆنەوەیە.

سەرچاوە:

دیکنسون امیلی(١٣٧٩) بە خاموشی نقطەها، ترجمە سعید سعیدپور، تهران: مروارید

سیلوا گابوودیگیان، شاعیر، نووسەر و چالاکی ئەدەبی-کۆمەڵایەتی لە ٢٠ی ژانوییەی ساڵی ١٩١٩ لە شاری یێرەڤان لە دایک بووە. ساڵی ١٩٣٦ خوێندنی ناوەندی لە قوتابخانەی کرۆپسکایای یێرەڤان تەواو کرد و هەر لەو ساڵەشدا خوێندنی خۆی لە لقی ئەدەبیاتی زانکۆی یێرەڤان دەست پێکرد. لە ساڵی ١٩٤١دا زانکۆی تەواو کرد و پاشان لە ساڵی ١٩٥٠دا خوێندنی بالای ئەدەبیاتی لە ئەنستیتۆی ماکسیم گۆرکی لە مۆسکۆ تەواو کرد.

سیلوا گابوودیگیان لە زۆربەی وڵاتانی جیهان وەک لوبنان، سووریا، میسر، فەڕانسە، ژاپۆن، کانادا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ژیاوە و بە هۆی چالاکی‌یە بەرینە ئەدەبی_کۆمەڵایەتی‌یەکانی بە دەیان جار نیشان و میداڵی شانازی وەرگرتووە و لە نۆیەمین خولی ئەنجومەنی باڵای دەوڵەتی ئەرمەنستان بە ئەندام وەرگیراوە.

گابوودیگیان بێجگە لە هۆندنەوەی شێعر لە پانتای شانۆنووسین، رەخنەی‌ئەدەبی و نووسینی بیرەوەریشدا کاری کردووە.

کار و نووسراوەکانی سیلوا گابوودیگیان تا ئێستا لە توێی دە کتێبدا بڵاوکراوەتەوە و بە زمانی نەتەوەکانی وڵاتی رووسیا و هێندێکی تر لە زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراون.

سیلویا ئەو شاعیرەیە کە شێعرەساتەکانی تەمەنی، وێڕای سروشت لە دایک دەبن، بەو مانایە کە ئەو واتایەی وا دەیهەوێ گیانی شێعری پێ ببەخشێ، سرووشتی ئەو ساتەی ژینگەی سیلوا لە خۆ دەگرێ و بالا دەکا. جیهانژینگەی سیلوا چاوەی سەرەکی شوێنوەرگرتن و هەڵێنجانی واتای شاعیرانە و هەستی ئینسانی‌یە. ئەو لەو شاعیرانەیە بۆ دۆزینەوەی بابەتی

شـێعرەکانی لـە کەرەسـەی سەیروسـەمەرە ناگـەڕێ، ژیـانی ڕۆژانـەی دەوروبـەری کۆمەڵگاکـەی خـۆی لـە پلـەی یەکـەمدا هـاندەرێتی. ئینسـان لـە واتای سەڵتی خۆیدا و خەمی ئینسانیش لە قالبێکی گشتیدا هەوێنی شێعری سیلوا پێکدێنن، هـەر بۆیـە لـە زۆر شـوێندا خوێنـەر بـەو ئاکامـە دەگا کـە لـە گەڵ شـاعیرێک بەرەوڕوویـە کـە بـۆ هـەموان و خـەمی هاوبەشـی هـەموان دەدوێ. ئـەو وێنەیـە لـە شێعری"ڕاوەسـتن خەڵکینـە"دا بـە ڕوونـی دەبینـین. شاعیر وەک هـەموو شـارۆمەندانی وڵاتەکـەی بـە کۆڵانـەکاندا دەخولێتـەوە تا ڕۆژێکـی نـوێ و چارەنووسـێکی نـوێ بـۆ خـۆی دەسـتەبەر بکـات، بـەڵام جیاوازی ئەو لە گەڵ هەموان لەوەدایە کە هەر لەو جیهانژینگەیەدا کە لـە گەڵ خـەڵکی تر و تەنانـەت هونەرمەندانی تر تێیدا شـەریکە، ئەوە ئەوە کە زەڕەبینی کامێرای وشـە و زەینی زووم دەکاتـە سـەر ئـەو سـووچەی کۆڵان، کـە داماوێـک تێـیدا شـین دەگێـڕێ. لـەو شـێعرەدا سـیلوا لـە پلـەی یەکـەمدا، وردبینییەکی هونەرمەندانە دەردەخا، کە شـاعیرانی گشـتیبین کـەمتر ئـاوڕی وێ دەدەن. لە پلـەی دووهـەمدا، ڕەخنەیـەک ئاراستەی ژیانی پڕ گرێوگۆڵی دونیای نوێ دەکا کە لەو دونیا نوێیەدا تاقمێک لـە پەراوێز دان و فـەرامۆش کـراون، لـە پلـەی سـێهەمدا، لـەو نـەزم و یاسـا نوێیـەی بۆتـە هـۆی لـە بیرچوونـەوەی ئینسـان و خـەمی ئینسـانی دەدوێ. ئـەو شـێعرە بـە جۆرێک وەبیرهێنـەرەوەی شـێعری "هـۆی مرۆڤـەکان"ی "نیمـا یووشـیج"ە. ئـەویش هاوارێکی لەو چەشنە دەکا بۆ دەربازکردنی کەسانی لـە زەریادا لێقەوماو و وەبیر هەمووان دێنێتەوە کە لێیان بێخەم نەبن.

لەکۆڵاندا ژنێک داماوانە دەگریا

من بە لای دا_ وەک ئاسۆیەکی دوورە دەست-
ملی ڕێی خۆم گرتبووە بەر.
هێلی ئاسن لە گەڵ تەگەرە پیرەکان دەدوێن
دەقیژێنن، ژەنگ هەڵدێنن و تووڕە دەبن.
دەڵێی ئاسنیش دەفامێ ...

سیلوا نەوەک هەر بۆ ئەو شێعرانەی خەمی کۆمەڵایەتیيان پێوە دیارە، بەڵکوو بۆ دەربڕینی هەستە ناسکەکانی خۆشی دەستەوداوێنی سرووشتی ژینگەیە:

ترسی ئەوەم بوو کە لەخەو ڕادەبی سەرلەنوێ و
وێڕای بەهاری شۆڕشگێڕ دێیەوە
بەفری لەبیرچوونەوەم هێور هێور
دەتوێتەوە و
تۆ وەک گەزیزە
هەمیسان لە خاکەوە دێیە دەرێ.

سرووشت بۆ سیلوا ئامرازی شێعرە، ئەو هێندە هۆگری ئافراندنی واتا دەروونیيە قورس و مانا بەرز و دەستکردەکان نییە، ئاسمان، دارستان، چەم، ئەستێرە و ... ئەو شتانەن کە بۆ درکاندنی شێعرەکانی هەمیشە یارمەتی دەدەن و ئەویش شاعیرانە دەیانپێکێ. لە شێعری بانگی پاییزدا کە سیلوا بانگ دەهێڵێتە دڵدارەکەی، وەرزەکان دەبنە هەوێنی و یارمەتی دەدەن:

بە پاییزی خۆم هەرات لێدەکەم
بە ئەزموونی پاییزییەوە.

به خەفەتی بێسنووری گەڵاکانی خەزەڵوەر

وەرە!

ئیتر باڵندە لە ئاسۆی رووە و بەفرانباری منەوە

بەرەو گەرمێن کۆچ دەکەن

خەم و خۆشی، رۆیشتن و گەڕانەوە، ژیان و مردن، هەمووی ئەوانە تەنیا و تەنیا لە سروشتدا دەنگ دەدەنەوە. دەڵێی ئەو شاعیرەیە کە بە بێ سروشت نایهەوێ بنووسێ یان بە واتایەکی تر ناتوانێ بنووسێ.

لە خولیای ئەوینی بەهاری دابووی

دڵەکەم!

وێڕای هەموو چرۆیەکت، وادەیەکی بەخشەندە بووی.

ئەو ساتەی ئەوین شناوە

تۆ هاوین بووی

بەپیت و زەنگین و زێڕین

کاتێک عەشق غەیان دەرچوو

ئەی دڵی من، تۆ وەک پاییز

سیس هەڵگەڕای و شەپۆرت گێڕا

بەڵام وێڕای ئەوانە سیلوا شاعیری نەتەوەی خۆشیەتی و چاوانی هاوڕەگەزەی خۆی هەمیشە دەناسێتەوە، ئەوەش چارەنووسی هەموو شاعیرانی نەتەوە بندەست و کەمینەکانە. شاعیری ئەو نەتەوانە لە گەڵ بارودۆخێکی جیاوازتر لە شاعیرانی تر دەستەوئێخەن. ئەوانە لە لایەک وەک شاعیرێک کە بۆ هەموو مرۆڤەکان دەدوێن و خۆ دەناسێنن و بە گوتەیەکی

تر خەم و شادی و هەستە گشتییەکانی مرۆڤ لە چوارچێوەی وشەدا بەند دەکەن، لە لایەکی دیکەوە، ئەوانە خەمێکی دیکەش دنەیان دەدا و هەستیان دەبزێوێ، ئەسرین دەزێنێتە چاویان و جاری واشە بزەیان لە دڵدا دەڕوێنێ. ئەویش خەم و شادی نەتەوەی بن دەست و پەراوێزکراوی خۆیانە، کە لە لایەن زۆرینەوە چەوساوەتەوە و لە بیر براوە و تەنانەت حاشای لێکراوە. ئەو شاعیرانە لەو بوارەشدا حەول دەدەن بەشێک لە لاپەڕەکانی ژیانی نەتەوەی خۆیان – بە شادی و خەفەتەکانییەوە، بە سەرکەوتن و تێکشکانەکانییەوە–لە بەرهەمەکانیاندا بنەخشێنن. سیلواش لە شێعری "چاو"دا بە باشی مێژووی خەمینی گەلەگەی بە جوانیناسییەکی تایبەتەوە دەگێڕێتەوە:

لە هەرکوێ بن
لە سەر هەر روخسارێک
روخساری پڕ لۆچی دایکێک
یان منداڵێکی گەنم رەنگ
یان لە سەر رووی تاوەسووتی بووکی شەکەت
ئەی چاوەکانی ئەرمەنی، ئێوە جوانن.

سیلوا پەژارە نەتەوەییەکان و رووحی ئاڵۆزی مێژوویی ئەرمەنییەکان لە چاویاندا دەناسێتەوە و سەردەمی قەڵاچۆکردنی ئەرمەنستان زیندوو دەکاتەوە، بەڵام ئەوجارەیان لە چاوی مرۆڤێکی ئەرمەنیدا:

ئەی چاوەکانی ئەرمەنی، ئێوە جوانن.

ئێوە کە ئەو هەموو فرمێسک و

کوێرەوەری و

خوێنەتان دیت،

کاتێکیش پەژارە دایدەگرن لە دایکی نیشتمان داوا دەکا بدرەوشێتەوە و بەختەوەری لەوەدا دەبینێ کە نیشتمان بەختەوەر بێ:

بێتوو بڕوانمە تۆ وڵاتە شینەکەم

کانییەکانی تۆش هەموویان لە کوڵ بن و

زەمزەمەیان زوڵاڵ و ڕەوان و ڕوون بێ

دڵی منیش دیسان بەختەوەرانە بزەی دێ

لە شێعرەکانی ڕا دەردەکەوێ کە کەسایەتی شێعری سیلوا کەسایەتییەکی ناهومێد و هیوابڕاو نییە، ئەو شاعیری ئەوین و درەوشانەوەیە و بەردەوام هەموو ڕستەکانی مەکۆی خۆشی و هومێدن. تەنانەت ئەو شێعرانەش وا بۆنی خەمێکی مێژوویییان پێوە دیارە بە ئاکامێکی پڕ هیواوە تەواو دەبن، ئەو شاعیری فەلسەفە قووڵەکانی ژیان و واتا تەجرەبە نەکراوەکان نییە، شاعیری سات و سروشتە و واتاکانی ڕاستەوخۆ لە گەڵ سروشت و هیوا تێکەڵن.

# چاوانی ئەرمەنی

لە هەرکوێ بن
لە سەر هەر روخسارێک
روخساری پڕ لۆچی دایکێک
یان منداڵێکی گەنم رەنگ
یان لە سەر رووی تاوەسووتی بووکی شەکەت
ئەی چاوەکانی ئەرمەنی، ئێوە جوانن.

ئێوە کە ئەو هەموو فرمێسک و
کوێرەوەری و
خوێنەتان دیت،
چۆن توانیتان لە ناو دڵی سەدەکاندا
ئاوا جوان و دڵبزوێن خۆتان راگرن و
ئاوا جوانیش لە باڵای هەستیی رامێنن.

# سترانی ئەوین

ئەو چۆمانەی لە بەهاردا
وا سەرکێش و تۆفانی بوون
هێور هێور سینگی نەرمیان دەکێشنە دوا.

نارِوانن، ئیتر نەماون
ئەو وەنەوشانەی
بە درێژایی رێگە لە گەڵمان بوون.

لەو بەهارەی کە بە یەکجاری تێپەڕی
-وەک گوڵێکی وشکهەڵاتوو لە دووتوێی لاپەڕەی کتێبێکدا-
هەر سترانی عەشقی من بە میرات ماوە
نووسراو بە جەوهەرێکی رەسەنی وەنەوشەیی.

# ئەگەرکوو

گەر بێتوو چاوانم بە شوێنتەوە بن
بە پیلوە تاریکەکانم دەیان بەستم
با لە دونیادا نەتبینن.

ئەگەر بێتوو زمانی سەرشێتم ناوت بێنێ
وەهای بە ددان دەکرۆژم
بۆ هەمیشە لە گۆ کەوێ.

بەڵام کاتێک دڵم
دڵم ویستی ناوت بێنێ و
تۆ بە چاوانی ببینێ
چاوی دڵم چلۆن لێک نێم؟
زمانی دڵم چۆن بکرۆژم؟

# شووالیە

لە دوورە دەست، لە وڵاتێکی بێ ناونیشان
لە ڕێیەکی دوور و نەدیو
بە دڵی شکاو دێت و دەچێ
ئەو
ئەو شووالییەی بە فیزی خولیاکانم.

سواری ئەسپێکی سپی یاڵ
زرێ لەبەر و چەک لە شان
دەخولێتەوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە و
لە جیهاندا بە شوێن ئەمن دا عەوداڵە.

ناوی پاکم، گۆرانی دڵە عاشقەکەی
قەڵا قەڵا و شار بە شار دەخاتە پشت سەر
ماڵ بە ماڵ لە من دەگەڕێ
بەڵام ناونیشانی ماڵەکەم نازانێ.

–ئەی شەکەتی ئاوارەی هەرێمێکی دوور

شووالییەی بێ سەروشوێنم!

خۆشم دەوێی.

هەر ئەتۆی وا لە هەستمدا هەناسەت دێ و

لە خەیاڵی کچێنی ئەمندا دەژی.

وا هەمیشە چاوم بڕیوەتە ڕێگای رووبەڕووم

چاوەڕێتم کە بێیەوە.

حیلەی ئەسپەکەت دەبیستم و

بە دڵم دادێ سەرەنجام هاتوویەوە.

بەڵام نا، بگەڕێوە، سەری خۆت هەڵگرە و بڕۆ

بڕۆ و دیسان هەر وڵاتەکان بپێوە

کۆچەرییەکی ئەبەدی ڕێگە نادیارەکان بە.

دیسانەوە بە شوێنمدا هەڵوەدا بە

لێگەڕێ پاکی هەتاوی ئەو ئەوینە

بە هیچ ماچێک گڕوێ نەبێ.

لێگەڕێ با، لە دڵی کچانەی ئەویندارمدا

تۆ وەک خولیا بمێنیەوە

پاک و بێگەرد.

# گۆرانی عەشق

ئەگەر ئەمن تۆم خۆش ناوێ

بۆچی زستان بەو رادەیە بەهاری‌یە؟

بۆ هەتاوی زستان گەرمە

ئاسمانی بێدەنگ بۆ قووڵە؟

ئەگەر ئەمن تۆم خۆش ناوێ.

ئەگەر تۆ منت خۆش ناوێ

بۆچی لە کۆڵانی ئێوە بەڕێزەوە وەرم دەگرن

ڕێبوار و ماڵ و ڕچە و بەفرەکان...

ئەگەر تۆ منت خۆش ناوێ.

گەر ئێمە یەکمان خۆش ناوێ

بۆ ئەستێرە بێ ئەژمارن؟

ڕۆژ و شەو ئاوا خەملێون و

جیهانیش وا دلۆڤانە و پڕ لە ئاشتی؟

گەر ئێمە یەکمان خۆش ناوێ.

# عەشقی رابردوو

ترسی ئەوەم بوو کە لەخەو رادەبی سەرلەنوێ و
وێڕای بەهاری شۆڕشگێڕ دێیەوە
بەفری لەبیرچوونەوەم هێور هێور
دەتوێتەوە و
تۆ وەک گەزیزە
هەمیسان لە خاکەوە دێیە دەرێ.

ترسی ئەوەم بوو لە پەنجەرەی ئاواڵەوە
وەک بەرامە و هەتاو دەڕژێیە ناوەوە
دەبیٚیە دەنگ و دەبیٚیە شەوق و
ئاوێتەی ئەو هەوایە دەبی کە هەڵیدەمژم.
من هەر ترسی ئەوانەم بوو
خەنی لە خۆم کە نەهاتی و
ئەو دڵەی منت نەهەژاند.
لێیگەڕێ با وچانێک بدا دڵەکەم

ئەو لەو بەهارەدا

زۆر سەیر لە گەڵم ئاشت بۆتەوە و

سەر بەخۆمە

وەها منداڵە و گوێڕایەڵ-هەر نەبێتەوە.

# دڵەکەم

له خولیای ئەوینی بەهاری دابووی
دڵەکەم!
وێڕای هەموو چرۆیەکت وادەیەکی بەخشەندە بووی.
ئەو ساتەی ئەوین شناوه
تۆ هاوین بووی
بەپیت و زەنگین و زێڕین
بێکۆتایی و بێ کەوشەن بووی
ئەی دڵی خۆم!
کاتێک عەشق غەیان دەرچوو
ئەی دڵی من، تۆ وەک پاییز
سیس هەڵگەڕای، شەپۆرت گێڕا و
بێدەنگانه رووت بوویەوه.
بەڵام لەبیرچوونەوه وەکوو کلوه بەفرەکان داباری
له ئامێزی وەرێنای و لاواندتیەوه
بوو بە خەمخۆرت–دڵەکەم!

ئێستە لەژێر بەفری قورسی زستانیدا

وا خەریکە هەڵدەستیەوە و

چەقەرە دەدەی

دڵی خۆم!

# من بە ئەوینی تۆوە، بە ئەوینی کەسێکی ترەوە، تۆ

لە کۆڵانەکاندا پیاسە دەکەین
من بە ئەوینی تۆوە و
تۆش بە ئەوینی کەسێکی ترەوە.
ئێمە لە سەر باڵی بڵێسەکان گڕ دەگرین
من بە ئاوری تۆوە و تۆ بە ئاوری کەسێکی ترەوە.

وا بە شەوق و حەسرەتەوە دادەنیشین
دەگەشێینەوە و خەفەتیش دامان‌دەگرێ
من بە قسەکانی تۆوە و
تۆش بە گوتەی کەسێکی دیکەوە.

شەلاڵی خەون و خولیای شیرین دەبین
من لە خۆشی دیداری تۆ و
تۆش لە دیداری یەکی دی.
ئاخ، چ کەردەن! دەبا بەخت هەر وا خەواڵوو بێ
لەو دونیایەدا لەبیرمان بکا و

ئێمەش تەنیا بە بڵێسەی ئەوینەوە گەشاوە بین

من بە ئەوینی تۆوە و

تۆش بە شنەی ئەوینی کەسێکی دیکەوە.

# تۆ درەوشاوە بە

لە گیانمدا ئاسمان و هەتاو لێڵ بوون و

هەورەکان لەشمیان گرتۆتە باوەش

-ئەی ئاسمانی نیشتمانم بدرەوشێوە!

ئەی هەتاو، هەتا هەتایە لە وڵاتی من تیشک باوە!

شادی و گۆرانی لە دڵی مندا کووژاونەوە و

خورەی کانیلەکانم ئێستاکە بە پەژارەن.

-ئەی ئاوەکانی وڵاتم، با بە شادی لرفەتان بێ!

چۆمەکانی نیشتمانم، شەپۆلتان برازێننەوە!

هەموو گوڵ و خولیا پڕ شکۆکانی من

لە پیدەشتی وڵاتمدا سیس هەڵگەڕان.

-هۆ پیدەشتی وڵاتی من! هۆ گوڵەکان!

کەرویشکە بکەن و سەر لە نوێ بپشکوێن!

بەختەوەری ئەوینی من هەڵوەری لە شەقامەکان
منیش دڵپڕ و بێدەنگ ئەسرین دادەبارێنم ئێستا

-کیژۆڵانی وڵاتی من! خوشکە خۆشەویستەکانم!
بەختەوەرانی هەمیشەم! بەردەوام بزەتان بێتێ

بێتوو بڕوانمە تۆ وڵاتە شینەکەم
کانییەکانی تۆش هەموویان لە کوڵ بن و
زەمزەمەیان زوڵاڵ و ڕەوان و روون بێ
دڵی منیش دیسان بەختەوەرانە بزەی دێ و
هەورەکانی لەشی منیش
بێ ناونیشان بارگەیان دەپێچنەوە و
ئاوا دەبن...

# کێڵ

دەتکوت ناوت لە گەڵ من لە دایک ببوو
هەمیشە لە سەر لێوم بوو
بەردەوام لە ناو دڵمدا.

تۆ ماڵ و دونیامت هەرتک داگیر کردبوو
دەم دەم شەپۆلت دەداوە لە ژیانمدا.

ئێستا کە چاوت تێدەبڕم
چەند گۆڕاوی!
دەڵێی میوانی وڵاتێکی تەریکی.

بوویەتە ژیلەمۆیەک لە دڵی کووژاوەمدا و
گۆرانییە عەشقاوییەکانم
بوونەتە کێلی گۆڕەکەت.

# بانگی پاییزی

بانگت دەکەم

بەڵام

نە بە بێتاوانی دارەکانی بەهار و

نە بە ئاسوودەیی رووباری بانەمەڕ.

بە پاییزی خۆم هەرات لێدەکەم

بە ئەزموونی پاییزییەوە.

بە خەفەتی بێسنووری گەڵاکانی خەزەڵوەر و

بە خۆفی ئەو رووبارانەوە

کە لە هەڕەتی هەڵچۆڕان دان.

وره!

ترسێکی زستانی

بە پێدەشتەکانی من وەر بووە.

هەناسەکانی زستانیش

پەرە دەگرن

من هەتاوی پڕشەنگداری تۆم گەرەکە.

وەرە!

ئیتر باڵندە لە ئاسۆی رووە و بەفرانباری منەوە

بەرەو گەرمێن کۆچ دەکەن

هەناسەی گەرمی تۆم دەوێ.

لە پەنجەی دارە شەکەتەکانی منەوە

دوایین میوەی دڵاوا و بەخشەندە

دادەوەرن

هێمنی بە شکۆی شادمانیم پێویستە

وەرە!

بە سەخاوەت و لە خۆبوردوویی پاییزەوە

بە شەمزاوی میوە پاییزییەکانەوە

بانگت دەکەم.

بە دوایین

سەرشێتیمەوە هەرات دەکەم

ئەی دوایین شێتیی ژیانم، وەرە...

# هاواری ئەوین

ئەو بەفرانەی لە چاوەڕوانیدا پیر بوون
لە شەوقی ئاورینی تۆ وا خەریکە دەتوێنەوە
بگەڕیوە.

ئەستێرە ئەویندارەکان تا کازیوە
لە چاوەڕوانی تۆدا دەکووژێنەوە
بگەڕیوە.

دارستانەکان هەزاران لقیان دەرکرد و
بە هەزاران دەست بانگت دێڵن
وەرە.

ئاوەکانی ئەم جیهانە
سینگ لە بەردەکان دەسوون و
بە حەسرەت و پەژارەوە گازت دەکەن
وەرە.

دونیا بۆ من تەنیا هاوارێکی شێتە
کە بە هەموو دەنگێکەوە بانگت دەکا و دەڵێ:
"وەرە".

# تاوان

ئەگەر تاوانێکە ئەوین لە دونیادا
لێگەڕێ با هەموو تاوانەکان بدەنە پاڵ من.

با دامنێن لە شوێنی تاوانباران
لێوەکانت با بکەنە دادوەری من
بە چینی بسکی رەشی تۆش لە دارم دەن
لە ئاکامدا
با من لە ئامێزتدا
لە ئامێزی تۆدا بنێژن.

## سبەی

ئەورۆ رابرد، باسی سبەینێم بۆبکە
ئەوەی ئەورۆ نەیگەیشتێی، هۆ دڵەکەم! لە سبەینێی بخوازە
هەر ئاوا تەمەن رادەبرێ.

بەڵام پێم وایە ئێستاکەش
دەبێ ژیان
لە سبینێوە دەست پێبکا.

# ڕاوەستن خەڵکینە

لە کۆڵاندا – پاڵی وە دیوارێکی لە سەرخۆ داوە– و
ئەسرین دەڕێژێ ژنێک
شیوەنێکی گەرم و بە کوڵ.

ڕووبارێک لە مرۆڤەکان بەرەو پێش لرفەی دێ!
ئەویش داماو و بێ جووڵە–
کەوتۆتە سەر باڵی بەستێن.

خەڵک ئاوزەنگی ئەسپی پەلەیان توند و
منیش لە ڕیزەی ئەواندا.

لەکۆڵاندا ژنێک داماوانە دەگریا
من بە لایدا–وەک ئاسۆیەکی دوورە دەست––
ملی ڕێی خۆم گرتبووە بەر.

هێڵی ئاسن لە گەڵ تەگەرە پیرەکان دەدوێن
دەقیژێنن، ژەنگ هەڵدێنن و تووڕە دەبن.

دەڵێی ئاسنیش دەفامێ
دەڵێی ئاسنیش ویژدانی هەیە و ژانی ویژدان
بێوچان شەمەندەفەر
بەرەوپێش دەخوشێ و ...
خولیاکانی منیش
– هەر لە چەشنی هێڵی ئاسن–
دەگەڕێنەوە بەرەو دوا.

لە شوێنێک شەپۆڕی شین دێ و
خەڵکیش بێخەم تێدەپەڕن.

- هەرچی زووتر هەموو شەمەندەفەرەکان بوەستێنن!
- مووشەک و فڕۆکەکانیش بێننە خوارێ!
- ماشینەکان بە تێکڕایی لە کار بخەن!
- کەشتی گەورە بگەڕێننەوە بۆ بەستێن!
هۆ خەڵکی بەهەڵەداوان!

بوەستن!

وچانێ بگرن!

داخۆ نابیستن

کەسێکی داماو شین دەگێڕێ؟

بچنە پێشێ و دەستێک بخەنە سەر شانی!

بیلاوێننەوە

بەگەرمای بلاوێنی چاوە نەرمەکانی خۆتان

مەهێڵن لە جەغزی تەنیاییدا

گوڵی گیانی هەڵبوەرێ!

هۆ ئاپۆرەی مرۆڤەکان!

لە تەنیشت ئینسانەوە بێخەم رامەبرن!

تەنانەت ئەگەر گیرفانتان

بلیتی هەڵفڕینی بە پەلەی–بەرەو گۆی مانگی– تێدابێ.

# له بیر بردنەوە

پێت وایە لەبیرت ناکەم
بەرینە دونیا
دونیا مەزرای خۆشییەکانە.

هەزاران برین دەم دەکەنەوە هەموو رۆژێ و
هەزاران زام سارێژ دەبن.
من سەر لەنوێ لە دونیادا لە دایک دەبم و
دیسان
-مەڵحەم دەنێمە سەر برینی خۆم-
ئەتۆش لە بیر دەبەمەوە.
تا هەتایە بە شنەی لەبیر چوونەوەت دەسپێرم.

کۆڵانە سەوزەکانی بەهاری مەستم دەکەن
منیش سەرمەستی خۆشییەکی دیکە

بۆ هەموو لا پەل دەبزێوم.

بە دەم ڕێبواران و دونیاوە پێدەکەنم و
دەخوازم دڵم بیر لە هیچ نەکاتەوە.
(ئای... هەڵوەدایی لە گەڵ تۆ چ شیرین بوو.)
کۆڕی بەزم و ویرەی جەژنەکان وا چاوم لێ دادەگرن
سەما و شایی و شادیەکانیش...
- هیوایەکی کەم تەمەن بۆ لەبیربردنەوە. -
ئاهەنگ دەگێڕن و هەتا شەبەقی بەیانی گۆرانی دەڵێن
منیش خۆم دەدەمە دەست شۆق و شەبەقی شادیەکان.
(چ بەتین و جوان گۆرانیت بۆ دەچڕیم.)

دەوران دەورم
گرمەی نوور و لاوانی لەباری زۆر جوان
کە بە بڵێسەی ئاوری نیگاکان داگیرساون.
منیش لە مژی مەستیدا خنکاو
بۆ چەند ساتێک وا هەست دەکەم بەختەوەرم.
(بەڵام تۆ چ ڕوانینێکی قووڵی بێبنت هەبوو)
لاوێک دەمباتەوە بەرەوماڵێ
هەنگاو دەنێم، شاد و سەرشێت

گاڵته دەکەین و دەلاقەی پێکەنیمان ئاوەڵایە.

پاشان

شەوباشێک پێک دەڵێین:

(ماڵئاوا"

ئەوە ئێستاش دەنگی تۆیە لە گوێمدا.)

پێت وایە لە بیرت ناکەم؟

سەرچاوە:

گابودیگیان،سیلوا(١٣٦٩)ترجمه نوری‌زاده، احمد، صد سال شعر ارمنی،

تهران: نشر چشمه،

مارگۆت بیکێل(Margot Bickel) لە شاعیرانی ناوبەدەرەوەی ئاڵمانە. لە ئێران بە باشی شێعرەکانی ناسراون و لە لایەن زۆر کەسەوە وەرگێڕدراون. بەشێک لە گرینگترین شێعرەکانی لە لایەن ئەحمەدی شاملوو شاعیری ناسراوی ئێرانییەوە کراوەتە فارسی و زۆر وەرگێڕی دیکەش شێعرەکانیان وەرگێڕاوە. بەڵام سەیر لەوە دایە، ئەوەندی شێعرەکانی ئەو خاتوونە ناسراو و پڕ لایەنگرن، خۆی وەک کەسایەتی و ناونیشان هیچ ناونیشانێکی ئەوتۆی نییە. تاقە زانیاری لەمەڕ ئەو شاعیرەوە ئەوەیە کە: ساڵی ١٩٥٨ لە ئاڵمان لە دایک بووە و پسپۆڕی (گوتە دەرمانی) و (خوداناسی یان ئیلاهیاتە).

# با

با دڵتەنگی‌یەکانی مرۆڤ
دەکاتە گۆرانی.

ئاسمانی پڕ ئەستێرە
خولیاکانی دەخاتە پشت گوێ،
هەموو کلوە بەفرەکانیش
وەک فرمێسکی نەڕێژراون.

بێدەنگی
لێوڕێژی گوتە نەدرکاوەکانە
"پڕە لە جووڵەی نەکراو
درکاندنی ئەوینە شاراوەکان و
ئەو شتە سەیرانەی بە زماندا نایەن.

لە ناو ئەو بێدەنگی‌یەدا
راستەقینەی ئێمە حەشار دراوە.

راستەقینەی ئەتۆ و
ئەمن.

# کە دەخوازی داگیرم کەی

کە دەخوازی داگیرم کەی
خۆشەویستم
لە کیسم دەدەی.

کە دەتهەوێ هاوڕێی من بی تا مرۆڤێکی ئازاد بم
خۆشەویستم
لە نێوانماندا یەکیەتیيەکی وا دەڕوێ
کە ژیانی هەردووکمان
بە شکۆفە دادەپۆشێ.

# ئاواتەخوازی ئەو چاوانەم

ئاواتەخوازی ئەو چاوانەم

بۆخۆم و خۆت

کە چرا و نیشانەکان

لە ناو تاریکی خۆمان‌دا

بەدی بکا.

گوێچکەیەکیش

کە دەنگ و هێماکان

لە بێهۆشیدا ببیستێ.

رووحێک

بۆخۆم و خۆت

کە هەموویان لە خۆ بگرێ و

زمانێکیش

کە لە سەداقەتی خۆیدا

لە بێدەنگیمان رزگار کا و

لێمان‌گەڕێ هەتا لەو شتانە بدوێین

کەوا کۆتوبەندیان کردووین.

# دەمەوێ قاڵ ببمەوە

دەمەوێ قاڵ ببمەوە
لە پانتای ئاسۆکاندا
لەو جێگەیەی کە دەریا کۆتایی پێدێ و
ئاسمانی شین دەست پێدەکا.

دەمەوێ لە گەڵ هەموو ئەو شتانەی منیان لە خۆ گرتووە
ببم بە یەک.

هەست دەکەم و پێدەزانم
دەستەکانم لێک دەسووم و دەترسم.

بڕوا دەکەم و هیوادارم
هیچ شتێ لە گەڵی ناکۆک نەبێ.

دەمەوێ بتوێمەوە
لە پانتای ئاسۆکاندا
لەو جێگەیەی کە دەریا کۆتایی پێدێ و
ئاسمان دەست پێدەکا.

# چەند جار هیوات پشکووت

چەند جار هیوات پشکووت، داوت ناوە
تا دەستێکی یارمەتیدەر
وتەیەکی پڕ لە میهرەبانی
لاواندنەوە
یان بیسەرێکی بە تابشت
ببینیەوە؟
داوەکەت بە بەتاڵی دیتەوە؟
دەست هەڵمەگرە
تەیار بەو
دیسان و
سەر لە نوێ
داو بنێوە!

# پاش سەفەرێکی درێژ

پاش سەفەرێکی درێژ و
تێپەڕین لە هەوراز و نشێوی ئەم دەریا تۆفانییە
وا دەمهەوێ
لە لای تۆوە لەنگەر بگرم.

بایەوانەکان بپێچمەوە
سەوڵەکانیشم دابنێم
فەرمانەکە بەر بدەم و
بێمە بێدەنگی و چۆڵی لەنگەرگاتەوە و
لە لای تۆ بگیرسێمەوە.

ئامێزی تۆ بدۆزمەوە و
زەوی پتەو و هێمنیش
لە ژێر پێمدا.

# ئەو هەمووە زینوێ و ملەیە

ئەو هەمووە زینوێ و ملەیە،

ئەو هەمووە بوارە،

ئەو هەمووە چرایە،

ئەو هەمووە نیشانەیە!

هەر وا بەردەوامیش سوور بوون لە سەر وادە و

وەفاداری

بە ڕێگەکەم

بە خۆم

بە ئامانجم

بە تۆ.

ئەو وەفایەی

کە ئەمن و تۆ

بەرەو ئامێزی ئامانجێک دەبا.

# لە ڕێبازی خۆت بگەڕێ

لە ڕێبازی خۆت بگەڕێ
ئەو جۆرەی من
وێڵم بە شوێن مرۆڤ بووندا.

لە نێو ڕێدا
چاومان دەکەوێ بە ڕاستەقینە و
ئازادی و
خۆمان،
لە ناو ڕێدا گەشە دەکا و بەر دەهێنێ
ئەو دۆستایەتی‌یەی هێزمان دەداتێ
تا بۆ خەڵک
داڵدەیەک بین و هاوڕازێک.

ئەوەیە ڕێگەمان،
ڕێگای تۆ و
ڕێگای من.

# لە ناخی هەموو کەسێکدا

لە ناخی هەموو کەسێکدا
نهێنییەکی زۆر گەورە شاراوەیە و
چیرۆکێک
رێگەیەک
کوێرە ڕێیەک.

گەڵاڵەی ئەو نهێنییە
-نهێنی من،
نهێنی تۆ و
نهێنی ژین-

ئاکامی مەزنی هەوڵێکی بەپیتە.

# زۆر جاران لەگەڵ یەکتری

زۆر جاران لەگەڵ یەکتری
لەخەم و شادیمان دەدوێین
بەڵام لە هەموو شتێکدا نهێنی‌یەک بەدی ناکرێ.
جاری وایە پێویست نییە
باسی برینەکان بکەی،

بێدەنگی، مەینەتی و خەفەت
دەتوانن
لە نهێنی‌یەکانمان بدوێن.

# تێتدەڕوانم و دەزانم

تێتدەڕوانم و دەزانم
پێویستت بە نیگایەکە
کە دڵخۆشیت بداتەوە و
دڵت داتێ،
ئارامشت پێ ببەخشێ،
بتگەشێنێتەوە و
درگاکەت لێبکاتەوە...
هەتاکوو تۆ وەدەرکەوی.

من پاشەوپاش دەکشێمەوە و
دەرگا نیوە ئاواڵەکە
بە رووی تۆدا
گاڵە دەدرێ.

# ئاڵقە بەردەوامەکان

ئاڵقە بەردەوامەکان،
بە دەوی یەکدا
تا دوورە دەست.

بڕیارێکی باش و ڕاستگۆیانە.

ئاخۆ لەگەڵ خۆم وەفادار دەمێنمەوە
یا ڕێگەیەکی ساناتر دەگرمە بەر؟

# هەڵمەت ناکەم

هەڵمەت ناکەمە سەر ئەوەی دڵخوازمە
بەڵکوو تەواو خۆمی بەسەردا دەکێشم

گەر بمهەوێ
دیسانەکە و سەر لە نوێ
هەستمە سەرپێ
جگە لەوە چارەم نییە.

# ئەوەندەی گازەندەمانە

ئەوەندەی گازەندەمانە
لە سەخڵەتی دەور و بەرمان،
لە تاریکی ئەنگوستە چاو،
لە قاتیی نوورێکی بەتین،

چون بەردەوام
گاڵە دەدەین
دەربیجەی ماڵۆچکەکان و
دەلاقەی رووحمان.

# من فێر بووم

من فێر بووم
گوێچکە بۆ خۆم رادێرم و
دەنگێک ببیستم
کە پێم دەڵێ
"ئەم ساتە"چ دیارییەکم دەداتێ.

فێر نەبووم
گوێ بۆو دەنگە رادێرم
کە قسە لە گەڵ من دەکا و
پەیتا پەیتا لێم دەپرسێ
من دەبێ چ دیارییەک پێشکەش "بەم ساتە" بکەم.

# هەورە بەفر هێنەکان

هەورە بەفر هێنەکان لە ئاسمان
پرچ تێک دەهاڵێنن.
با- دەشنێتەوە و
تۆفان دەگاتێ.

برینەکانم پیر دەبن.

# سەهۆڵ دەتوێتەوە

سەهۆڵ دەتوێتەوە

لە رووحمدا

لە ئەندێشەکانمدا...

بەهار

ئامادە بوونی تۆیە

بوونی تۆیە.

# هەڵفڕینی متمانە

هەڵفڕینی متمانە
پێکەوە دەچێژین
ئەگینا شاباڵی دۆستایەتیمان
هەڵدەوەرێ.

# کەسێک -بەڵێ- دەڵێ

کەسێک "بەڵێ " دەڵێ
بۆ لە دایک بوونم
بۆ ژیانم
بۆ بوونم
لاوازیم
بێهێزیم و
نەمانم.
کەسێک "بەڵێ" دەڵێ
بۆ من
بۆ تۆ و
لە چاوەڕوانی بەردەوامی
بیستنی وڵامی من و
بیستنی وڵامی تۆ
ماندوو نابێ.

# لەسەر هیچ نەخشەیەک

لەسەر هیچ نەخشەیەک
نیشتمانی مرۆڤەکان بەدی ناکرێ
نیشتمانی مرۆڤەکان
تەنیا لە دڵی ئەو کەسانەدا دیارە
کە خۆشیان دەوێ.

# نان

نان کردن

نان لەت کردن

نان بەش کردن

نان بوون!

# تەنیایی

لە تەنیایی دەرباز مەبە
بۆ تەنیایی دەرباز مەبە.

جاروبارێک
بۆی بگەڕێ
تاقەت بێنە و
دەرفەت بدە بە حەسانەوەی بیرت.

# گەمی

جاری وایە ئاواتمە بۆ تۆ ببم بە گەمی‌یەک
هەتا بتبەمە ئەو شوێنەی خۆت پێت خۆشە.

گەمی‌یەکی بەتاقەت بم
بۆ بارەکەی سەر شانی تۆ
گەمی‌یەک قەت وەرنەگەڕێ
هەرچەندە تۆ نەسرەوتوو بی و
هەر چەندە دەریا پڕ گێژەن.

# ژیانی سەرسووڕهێنەر

سەرسووڕهێنەر بوونی ژیان
بەو هەموو کەم دەوامی‌یەوە.

لە بوێری بوونە تۆدا
لە دلێری بوونە مندا
لە جەسووری بوونە شادی و
لە ناخی گاڵتە و جەفەنگدا ...

لە خۆشی بێکۆتایی بزەدا
لە تاقەت هێنانی ژاندا
شاراوەیە.

# هەوری پاییزی

هەوری پاییزی لە زەین و رووحمدا
هەوری پاییزی قورس و پڕ نسێ.

رووح لە ئارامش دایە
هزری مرۆڤەکان ناتوانین وەخوێنین
ئامانجیشیان ناتوانین بە چاو ببینین.

دڵەکان لە غوڕابی خەودان
بە هیوای بڵاوکردنی رەوەی هەورەکان.
هەورە پاییزیەکانی ناو زەین و رووحم.

# هەرگیز لە کەسێ ناپرسن

هەرگیز لە کەسێ ناپرسن
کەنگێ دەبێ ماڵئاوایی بکا.
لە کرداری مرۆڤانەی ناپرسن.
لە خودی خۆی ناپرسن.

ئاخری دەبێ
لە ناکاوێک
لە گەڵ ئەوە رووبەڕوو بێتەوە،
تابشت بێنێ
وەریانگرێ
ماڵئاوایی
ژانی مەرگ
هەرەسهێنان،
تا دیسانەوە بتوانێ "هەستێتەوە".

# بەفر

تەپکی بە بەفر داپۆشراو

داری بە بەفر داپۆشراو

ریگای بە بەفر داپۆشراو.

ئەوەی بەسەر بەفردا هەنگاو هەڵدەگرێ

شوێن پێیەک بە جێدەهێڵێ

کە مرۆڤ هان دەدا

شوێنی هەڵگرێ.

تەپکی داپۆشراو بە بەفر

داری داپۆشراو بە بەفر

رێگای داپۆشراو بە بەفر – و

بەردەوام لە شوێنێک

هێمایەک لە ژیان.

# وەک باڵندە

وەک باڵندە
کە بەشکۆوە هەڵدەفڕێ
باڵەکانی دەکاتەوە و
بە دەم هەڵفڕینەوە رادەبرێ،
دەخولێتەوە و
هێدی بە حەوادا دەخزێ...

وایە مرۆڤ
خولیایەتی کە هەڵفڕێ
دوور هەڵفڕێ.
رێگەی خۆی بدۆزێتەوە و
لە هێمنیدا بگەڕێ....

وەک باڵندە

که دەنیشێتە سەر زەوی

باڵەکانی دەبەستێت و

چینە دەکا،

دەکەوێتە مەترسی و داوی راوچی‌یەوە

مرۆڤیش دەگەڕێتەوە

تەیارە تا

خۆی بسپێرێتە دەست ژیان و

چارەنووس.

# ڕێبازی ئازادی

دواهەمین گزنگی هەتاوی دەمەوئێوارە

ڕێگایەکم پێ دەنوێنێ

کە دەخوازم بینووسمەوە.

ئەو هەورانەی بە شنەی با دێن و دەچن

ڕێگەیەکم پێ دەنوێنن

کە دەخوازم بینووسمەوە.

خشە خشی گەڵاکانی ژێر هەنگاوم

بە من دەڵێن:

لێگەڕێ تا بڕستت لێدەبڕێ

ئینجا ڕێبازی ئازادی

دەبینیەوە.

# له ژێر پێمدا

له ژێر پێمدا
خاک دەلەرزێ له سمکۆڵی ئەو ئەسپانەی
که تەقڵەکوت تێدەپەڕن
زۆر شێتانه، لغاو پساو و شڵەژاو،
ئەسپەکان
دەپڕمێنن و غار دەکەن.
له یاڵیان ئالاوە ئاواتەکانم
شان به شانیان رادەکەن
ویستەکانم.
هەوا پڕە له بەرامەی ئەسپ و
خەفەت و
تۆزقاڵێک خۆزگە...
له لای ئاسۆ

سەما دەکەن خاڵە رەشە بچووکەکان

ئەو خاکەی وا

لەسەریشی وێستاوم

سەرلەنوێ هێور بۆتەوە

دەڵێی هەموو ئەوانە خەونێک بوون:

خەونی ئازادی

یان

هەستکردن بە کۆتوبەند.

# ڕۆژگار

دار هەرچی پیرتر بێ

قایمتر و بە بایختر.

پنجەکەی هەرچی قووڵتر بێ

داڵدەیەکی دڵنیاتر.

نێوقەدی هەرچی ئەستوورتر

پشتیوانێکی متمانەبەخشتر.

تاجی چڵ و گەڵای هەرچی پانوپۆڕتر

نسێکەی میوانگرتر.

هەر بازنەیەکی کۆلکەکەی

هێمایەکی ئاشکراتر

لەو ڕۆژگارەی ڕاببواردووە:

وەک گنجێک

لەسەر تەوێڵێک.

# ژاكاو

ژاكاو

لە ناو دڵی بەهاری گەرم و

لە وڵاتێکی بەستەڵەکدا.

وشەکان بەتاڵ لە ئەوین

لاواندنەوەیەکی زۆر سارد.

ژاكاو لە ناو دڵی هاوینێکی بە تیندا

لە دووپاتەیەکی خەفەتهێن،

بێوازی و

دڵساردیەکی مەرگاوی.

ژاكاو لە ناو دڵی پاییزی دڵگر و

لە بێخەیاڵیدا.

ڕوانینێکی دڕدۆنگ و

ناهومێدی.

قاڵ

لە ناو دڵی زستانێکی سەختڵەتدا

لە ناو دەستێکی گەرم و

لە نیگایەکی میهرەبان و

لە هاڵاوی هەناسەیەکی بەتیندا.

# ئەو ڕۆژە دێ

ئەو ڕۆژە دێ
کە چۆمەکان بەرەو بەرزایی بخوشێن و
کلوە بەفرەکان
لە حەوادا بە مۆلەق بوەستن.

منداڵان بەرەو بلووغ و
گەورەکان بەرەو منداڵی گەشە بکەن.
تەنانەت زەوینیش ڕێگەی بەرئاوەژوو بگرێتە بەر

با- هەموو شتێک ڕامالێ و
زەوین لە خۆیدا خول بخوا و
هوشیارەکان
لە هەموو شتێک سڵ بکەن.

ئەگەر دیسان تۆو بچێنی
مرۆڤایەتی دەتوانێ
هەتا ئەو پەڕ گەشە بکا.

# زۆر ساکارە

زۆر ساکارە لاواندنەوەی سەگێکی بەڕەڵلا
دیتنی ئەو کاتەی وەبەر غەڵتەکێک دەکەوێ و
گوتنی ئەوەی "خۆ ئەوە سەگی من نەبوو".

زۆر ساکارە ستایشکردنی گوڵێک
لێکردنەوەی
لەبیربردنەوەی ئەوەی دەبێ ئاو درێ.

زۆر ساکارە چەوساندنەوەی مرۆڤ
خۆشویستنی بە هەستێکی ئەویندارانە
پاشان وەپشت گوێ خستنی و
گوتنی ئەوەی "کە ئەمن ئیتر نایناسم".

زۆر ساکارە ناسینەوەی هەڵەکان

ژیان لە گەڵ خەڵکی و

لەسەر ئەرکی خەڵکی و

گوتنی ئەوەی

بەڵێ من وام.

زۆر ساکارە چلۆن ژیان

بەڵی.... ژیان زۆر ساکارە و

هەڵبەت زۆر پێچەڵاوپێچیش...

سەرچاوە:

١-همچـون کوچـەئی بی‌انتهـا،(١٣٧٦) گـردآوری و ترجمـه احمـد شـاملو، چاپ چهارم، تهران:انتشارات نگاه

٢- بیکـل، مـارگوت(١٣٦٥) چیـدن سـپیده دم، ترجمـه آزاد توسـط احمـد شاملو و محمد زرین‌بال، نشر ابتکار

٣- بیکل، مارگوت(١٣٨٢)عاشقانەهایی کـه مـن دوسـت مـی‌دارم، ترجمـه ندا زندیه، انتشارات دارینوش (تهران)، ،

٤-بیکل، مارگوت،(١٣٨١) فرشـتەای در کنـار توسـت، ترجمـه: نـدا زندیـه، تهران: انتشارات دارینوش

٥- بیکل، مارگوت (١٣٦٥) سکوت سرشار از ناگفتەهاست، ترجمـه آزاد و اجرای اشعاری از مارگوت بیکل توسط احمـد شـاملو و محمـد زرین‌بـال، ، نشر ابتکار

زینائیدا هیپووس لە شاعیرە ئایینی و سەمبولیستەکانی رووسیایە. لە تەمەنی بیست ساڵیدا لە گەڵ نووسەری بەناوبانگی رووسی "میرژووکۆویسکی"دا زەماوەندی کرد. ئەو لایەنگری ژنومێردایەتی دۆستانە بوو. نایەکسانییەکانی نێوان ژن و پیاو دەیڕەنجاند. ئەم شاعیرە لە ژیان و هەر وەها لە نووسراوەکانیشیدا بە دوای دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ چارەسەرکردنی نایەکسانییە کۆمەلایەتییەکان بوو. ئەو و مێردەکەی لەو دەستە لە رۆشنبیرانی رووسیا بوون کە بۆ وەدەستهێنانی ئازادییە سیاسی و ئایینییەکان پشتیوانییان لە شۆڕش کرد، بەلام پاش شۆڕش ناهومێد لە گەیشتن بە ئامانجەکانیان، بەرەو پاریس کۆچیان کرد و لەوێ هیپووس بوو بە یەکێک لە دوژمنانی هەرە توندی شۆڕشی یەکیەتی سۆڤیەت و هەر لە پاریس مرد. شێعری ئەو لە سەر شاعیرانی دوای خۆی وەک بلووک، ئاخماتووا و ماندلشتایم کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبووە.

# چارۆکەی خۆڵەمێشی

هۆ کیژۆڵە چارۆکە خۆڵەمێشی‌یەکە
پرچت وەکوو لۆکە دەچێ
کیژۆڵە، کیژۆڵە تۆ هی کێی؟

هی دایکم... یان، رەنگە هیچ کەس

کە بخوازی هی تۆ دەبم.

هۆ کیژۆڵە چارۆکە خۆڵەمێشی‌یەکە
ئاخۆ دەستت ئاشنان بە لاواندنەوە
ئازیز ؛چاوت بۆچی وایە:
ئەو چاوە هەڵکەنراوانە، ئەم قولکە چاوە چۆڵانە
راست بە وێنەی قولکەکانی چاوی دایکم.

هۆ کیژۆڵە چارۆکە خۆڵەمێشی‌یەکە
ئەوە کایە بە چی دەکەی
چییە لە منی دەشاریەوە؟
داخۆ دەرفەتێک هەیە من کایە بکەم

لە ناو ئەو هەمووە کارەدا

ئیشتا دەبێ لزگە تەسبێحێک بپسێنم

ئیستا دەبێ غونچەی گوڵێک پەڕ پەڕ بکەم

ئێستا دەبێ لاپەڕەکانی دەفتەرێک بە با دادەم

یان دەبێ باڵی باڵندەیەکی بچووک بشکێنم.

هۆ کیژۆڵە چارۆکە خۆڵەمێشی‌یەکە

هۆ کیژۆڵە چاو چۆڵەکە! دا پێم بڵێ ناوت چییە؟

هەرکەس بە ناوێک دەمناسێ

تۆش چۆنت پێخۆشە هەر ئاوام بانگ بێڵە

تاقمێک دەڵێن دووبەرەکی

هێندێک دژایەتی

دەستەیەک دڕدۆنگی

یان دڵتەنگی

کۆمەڵێک پێم دەڵێن رەنج و

ئاپۆرەیەکی تریش دەرد

دایکیشم هەر بە "مەرگ" و "دووری"م بانگ دەکا

ئاخ کیژۆڵە چارۆکە خۆڵەمێشی‌یەکە!!

# دڕدۆنگی

لەگەڵ وشەی هەرماندا
زەمانی لەگەڕ بێکۆتایە

من تەنیا هەست بە شتێکی تر دەکەم
بە ژامی ساتێکی نوێ

ئاخۆ ئەم شنەیە بەرەو تێکشکانم دەبا یان سەرکەوتن
لەگەڵ خۆیدا وێرانی بە دیاری دێنێ یان شانازی
ئەمن روخساری نابینم

ئەمن تەنیا شنینەوەی لە ناکاوی هەست پێدەکەم

ساتەکان هەڵدەفڕن بە روخساری تەم گرتووەوە
وەک باڵندەی دونیایەکی بەرین
بەرەو پانتایی بێسنووری ژین

چۆن دەتوانم پێش بە هەڵفڕینیان بگرم

ئیتر ئاوا، لە هروژمی بێمەودای ساتەکانیشدا
لە داوی داوە تەنراوەکانیان
ئارامشم دەچڕژێ
لە بواری ساتە رەشەکانی دڕدۆنگی.

بلاگا دیمیتروا خوێندنی باڵای خۆی لە لقی فەلسەفەی زانکۆی سووفیا تەواو کرد و بە هۆی نووسینی تێزە سەرکەوتووەکەی بە ناوی "مایاکۆفسکی و شیعری بولغار" توانی پلەی دکتۆرای زانکۆی مۆسکۆ وەرگرێ. زیاتر لە بیست کۆمەڵە شیعری چاپ کردووە کە زۆربەیان لە لایەن ئاواز دانەرەکانەوە پێشوازی‌یان لێ‌کراوە و کاری مووسیقای زۆر جوانیان لێ سازکراوە. هەروەها ئەو شاعیرە وەرگێڕی شوێنەوارە ئەدەبی‌یەکانی لەهێستان، ئاڵمان، فەڕانسە و لاتینە. جگە لەو کۆمەڵە شیعرانە چەند رۆمانی جۆراوجۆریشی نووسیوە کە دەکرێ لەوانە ئاماژە بە چەند رۆمانێکی وەک؛ "سەفەر بۆ ناو خۆت"، "لاڕێ بوون" و "روخسار" بکەین. ئەو رۆمانانە هەر کام رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی تایبەتی خۆیان لە ئاستی جیهاندا هەبووە. بۆ وێنە رۆمانی یەکەمی بە زمانە زیندووەکانی جیهان وەرگێڕدراوە. رۆمانی دووهەمی کراوەتە فیلم و خەڵاتی نێودەوڵەتی وێنیزی بردۆتەوە. رۆمانی سێهەمیشی بە هۆی ناوەرۆکە دژە کۆمۆنیستی‌یەکەی بۆ ماوەی چەند ساڵ بەر بە بڵاوبوونەوەی گیراوە.

بلاگا دیمیتروا کە لە خۆشەویستترین و باشترین نووسەرانی رۆژهەڵاتی ئووروپا دێتە ئەژمار، شوێنەوارە ئەدەبی‌یەکانی بەزۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕدروان، لە ساڵە دوورودرێژەکانی حکوومەتی کۆمۆنیستی یەکجار توندی بولغارستان، رێبەرایەتی بوێرانەی حیزبی دژ بە دەوڵەتی دەکرد و ژیانی خۆی تەرخانی بەرگری‌کردن لە مافی مرۆڤ و ریفۆرمە سیاسی‌یەکان کرد. بۆ رێزلێنان لە تێکۆشانی پاک و

ماندوویی‌نەناسانەی لە ڕێی ئازادی‌دا، ساڵی ١٩٩٢ لە حکوومەتی دێموکڕاتی تازە بنیات‌نراوی بولغارستان‌دا کرا بە جێگری سەرۆک‌کۆمار.

شێعری بلاگا دیمیتروا بە بەراورد لە گەڵ شێعری شاعیرانی هاونەسلی خۆی لە باری دارشتنەوە جیاوازی‌یەکی بەرچاوی هەیە. کەم‌تر شێعرێک لە بەرهەمەکانی ئەو شاعیرەدا هەیە حەولی گێڕانەوەی دیاردە زەق و ئەزموونە گشتی‌یەکان بدا. ڕوانینی فەلسەفی بلاگا بۆ دونیا و هەموو دیاردەکانی پێوەندی‌دار بە ئینسان و سروشتەوە بۆتە هۆی ئەوەی لە گەڵ کۆمەڵە دەقێکی شێعری بەرەوڕوو بین کە ڕووی فەلسەفی دیاردەکان دەخەنە ژێر پرسیار. بە واتایەکی تر، دەتوانین بڵێین پرسیار لە چۆنێتی بوون و چییەتی بوون بەشێکی زۆری هەرێمی بیری ئەو شاعیرەی داگیرکردووە. ئەگەر تاقمێک لە شاعیرانی هاونەسلی ئەو بە شێوەیەکی زەق‌تر لەو خەریکی پرسیارن لە ئەزموونە تاکەکەسی و ڕۆژانەکان، ئەو لە ئەزموونە ئینسانی‌یەکان دەپرسێ، بە گوتەی بیرمەندەکان، پرسیاری ئەو پرسیاری مرۆڤە وەک مرۆڤ لە واتایەکی گشتی و فەلسەفی‌دا نەک لە مرۆڤ یان ئەزموونێکی مرۆڤانەی تایبەت. هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی شێعری ئەو لە چاو ئەزموونی شاعیرانی تر هەندێک جیاواز بنوێنێ. ئەو جیاوازی‌یەش هەم لەو واتایانە دان کە وەها شیعرێک بەرهەمی دێنێ و هەم لە شێوەی دەربڕینی ئەو شاعیرەدا خۆ دەنوێنێ. باس لە دڕدۆنگی مرۆڤ سەبارەت بە جیهان و ئەوپەڕی جیهان لە چوارچێوەی گێڕانەوەیەکی هێڵی‌دا ناگونجێ، چون بوونی مرۆڤ و جیهان بوونێکی هێڵی و یەک‌پارچە نییە. بوونێکە کە

وەک کۆلاژێـــک لـــە واتـــا و پرســـیار و ڕووداوەکـــان، بـــە هـــەموو ڕەنگاوڕەنگییانەوە پێکهاتووە. باس لە وەها بوونێک، یان پرسیار سەبارەت بەو بابەتە و لە لایەکی دیکەوە خستنە ڕووی هەندێ دڕدۆنگی و جاری وایە گریمانەی فەلسەفی، زمانێکی وا دەخوازێ کە هەڵگری ئەو قورساییانە بێ. دەربڕینێکـی لـەو چەشـنە بێشـک دەربڕینێکـی یەکپارچـە و هێڵـی نـابێ. شاعیری شێعرێکی وا حەول دەدا پرسیارەکان پچڕ پچڕ ئاراستە کا. ڕەنگە لـەو پرسـیارانەشدا بـە شـوێن وڵامێکـی تایبـەتدا نەگـەڕێ. ئـەو پرسـیار و دڕدۆنگـی دەخاتـە بـەردەم مرۆڤـی سـەردەم و پرسـیار و وڵامەکانیشـیان دەهێڵێتـەوە بـۆو خوێنـەر و فیلسـووف و بیرمەندانـەی دەچنـە سـۆراغی دەقەکەی. شاعیرێکی وا ئەگەر وڵامێکیشی هەبێ، وڵامەکەی هێندە سەرڕاست و بێ گرێوگۆڵ نییە کە خوێنەر لە پرسینی دووبارە و گەڕانی دووبارە بە دوای وڵامدا بێنیاز بکا.

ئەگەر شاعیری دیکە یان نووسەری بوارەکانی تر، دەق بە مەکۆیەک بۆ ڕوونکردنەوەی زەینی خوێنەری خۆیان دەزانن، بلاگا ئـەو ئەرکە بۆ دەقی خۆی بە کردەوە قایل نییە. تەنانـەت کاتێک لـە وجوودی خۆشـی دەدوێ ئـەو خـودەی ئـەو لێـی دەدوێ خودێـک نییـە تاکسـووچ و تاکڕەهەنـد. ئـەو لـە ئینسانێک دەدوێ لە چەندین بەش و هـەر بەشـەش لـە دونیایەکی بـەربڵاو لـە واتاکـان پێکهـاتووە. ئەگـەرچی ئـەو بەشـی ڕاسـتەقینەی بـوونی خـۆی بـەو بەشە دەزانێ کە لـە ڕەهـایی تـەواودا، وەک منداڵێک لە دووره دەستێک دێتە بەرچاو. بەڵام لێرەشدا نە تـەنیا حاشا لـە هـەبوونی بەشـەکانی تـری وجوود

ناکا، بەڵکوو ئەوانیش وەک ئەگەرێک بۆ بوون لە بەرچاو دەگرێ. شاعیرێک کە روانینێکی ئاوای سەبارەت بە خۆی هەبێ، بێشک سەبارەت بە دیاردەکانی تری جیهان بۆچوونێکی تاک رەهەند بە دەستەوە نادا. هەڵبەت وە نەبێ کە جگە لە بلاگا دیمیتروا روانینی وا رێژەیی و فەلسەفی، لە لایەن شاعیرانی دیکەوە نەخرابێتە روو. هەر لە شاعیرانی هاونەسل و تەنانەت هاورەگەزی خۆی، کەسێکی وەک شیمبۆرسکا هەیە کە کۆی بەرهەمەکانی تەرخان کراوە بۆ دوان سەبارەت بەو پرسیارانە و هەروەها بۆ خستنە رووی جهیانێک دڕدۆنگی تازە. لە خۆڕا نییە کە ئەویش دەڵێ(متمانە جوانە بەڵام دڕدۆنگی جوانترە). لە شاعیرانی کوردیشدا نموونە شێعری وەها دڕدۆنگی هەلاییسێنمان هەیە. شێعری بەرزی "سازی ناساز"ی مامۆستا هێمن لەو شێعرە پتەوانەیە کە پرسیار لە چییەتی بوون دەکا و سەیر ئەوەیە کە وەک مامۆستایەکی لێزان هەموو ئەگەر و شیمانەکان بۆ بوون دەخاتە روو، بەڵام لە ئاکامدا وڵامێکی موتڵەق ناداتەوە، بەڵکوو دوای خستنە ڕووی ئیمکانەکانی بوون، دڕدۆنگییەکی فەلسەفی دەخاتە بەردەم خوێنەر:

(چۆن دەتوانم بە تۆ بڵێم من چیم   خۆم گومانم هەیە کە هەم یان نیم).

لە ئاکامدا دەتوانین بڵێین شێعری بلاگا بە ناوەرۆک و فۆرمی جودایەوە، شێوە خوێندنەوەیەکی جوداش دەخوازێ.

# راکردوو لە دوورە دەستەکاندا

بەشێک لەمن،
بەردەوام لە حەسرەتی گەرمادا و
بێبەش لە تین و تاوی ئەو.

بەشێک لە من،
تەبا لە گەڵ کازیوەی رووناک و
بەردەوام یەخسیری سێبەری خولیاکان.

بەشێک لە من،
پڕ پڕ لە باڵی فڕین و
ونی کردووە بەشی خۆی لە شیناوەردی ئاسمان.

بەشێک لە من
منی راستەقینە؛ بە چاوی منداڵێکەوە
هاوڕێی باڵندە کۆچەرەکان،
راکردوو لە دوورەدەستەکاندا ...

# پێشوێژی

ژامی کەلام لێدەدرێ
ڕاست لە ساتێکی چاوەڕوان نەکراودا

ڕاستەقینەش دەگرمێنێ
وەک بارانی بەهاری بە سەر شیروانیدا

چۆمەکانی وتەش دەخوشێن
بەرەو ژوور، بەرەو سەرچاوە

بەردەکانیش لە جێی خۆیان دەبزوێن
هەرکام بەرەو شوێنی کوێستانی خۆیان

دارەکانیش لقوپۆپ دەردەکەن
دەست ڕاداشتوو بەرەو بەرۆکی ئەستێران

گوڵەکانیش دەپشکوێنەوە سەر لەنوێ
لە سەماشدا، بەدەم شنەی نەرمی باوە

باڵندەکانیش دەگەڕێنەوە هەمیسان
بە دندووکیان-گۆرانیی‌یەک لە سەهۆل ساز دەکەن

گۆڕەکانیش درز دەبەن
کەللەسەرەکانیش بە قووڵکە چاوی بەتاڵەوە
وەک ژامی رابوون وە دەنگ دێن

هیچ خوێنێکیش نارژێتە سەر عەرز
تەنیا لەبەر تیغی شەفابەخشی کەلام
خوێن دەگەڕێتە دەمارە وشک هەڵاتووەکان.

# کلیلی ون بوو

بە کلیلی وتە
دەمویست دەرکێک بە رووی نەگونجاوەکاندا بکەمەوە

بە کلیلی ئوستوورە کەوناراکان
دەمویست دەرکێک بەرووی دونیای نوێدا بکەمەوە

بە کلیلی مووسیقای بلاوێنی باخ
دەمویست دەرکێک بە رووی ئەوپەڕدا بکەمەوە

بەکلیلی خولیا سەرخۆش کەرەکان
دەمویست دەرکێک بە رووی دڵدا بکەمەوە

ژەنگی هێناوە!ناسووڕێ!

بە کلیکی گریمانە

دەمویست دەرکێک بە رووی گەشەی کۆمەڵایەتی‌دا بکەمەوە

بە کلیلی غەریزە

دەمویست دەرکێک بە رووی سروشتدا بکەمەوە

بە کلیلی سەرکەوتن

دەمویست دەرکێک بە رووی بەختەوەری‌دا بکەمەوە

بە شاکلیلی وادە و بەڵێنەکان

دەمویست دەرکێک بە رووی داهاتوودا بکەمەوە

ژەنگی هێناوە!ناسوورێ!

دە پێم بڵێن هۆ پێغەمبەر و فیلسووف و سترانبێژەکان

کامەیە کلیلی ون بوو؟

## وەک چۆن بەبر، برینەکانی

چلۆن هێشتت کە زمانت

سڵ، سەرکێش و نادەستەمۆ

لە حەوشە ددانیەکان‌دا

دەستەمۆ بێ؟

وشەکان دەلێسێتەوە

وەک چۆن بەبر،

برینی خۆی...

لە رکەیەکی داخراودا

ریسالەتەکەی، قوڵپەیەکی لەنەکاوە
لەخوێنی خۆیدا
گرمەیەک، لە دەمەدەمی تەقینەوەدا.

دژی خۆیەتی
بە توندی گاز لە خۆی دەگرێ
بێدەنگی ڕەوان دەبێت و
لە پشت ددانەکانەوە
زمان، خوێنی لێدەچۆڕێ!

# ئەگەر

کاتێک بگەڕێیەوە،

ئەگەر بگەڕێیەوە-

که تا ئێستا نەگەڕاوێوە،

شوێنی بەتاڵی خۆت دەبینی.

هەموو ڕێگاکان درێژەیان دەبێ

بەرەو ئاسۆی جۆراوجۆر

تەنیا ڕێگای ئەتۆیە داخراو دەبێ.

کەلامی سڵاو و ناسیاوی تۆ-

مات و مەلوول-

بە نامۆیی دەبیسترێ.

شەرمەسار هەنگاو دەنێیە ژووریَ

وەهاش دەڕوانییە دەورووبەر

هەر دەڵێی لە ماڵێکی فەرامۆشکراو، بە خەون دیتراو...

قامکەکانیشت هەست دەکەن

بە شوێنی بەتاڵت

لە کتێبەکاندا و لەو شتانەی جێیان گۆڕاوە.

ئەتۆش تێدەگەی

هەموو شتێک گۆڕاوە

ئەویش نەک هەر لە ماڵەکەی ئەتۆدا

بەڵکوو لە هەموو جیهاندا

زۆر ساکار و سروشتی

پڕی دەکەنەوە ئەوان

ئەو شوێنەی لەوە پێش تۆ پڕت کردبۆوە.

# ناسیاوی لەگەڵ ئەوپەڕ

لە دەمی گیانەڵڵادا تەواو وشیار
بە هەموو هێز هەوڵت دەدا
هێدی بمری
بێ هاوارێک، بێ ناڵەیەک،
تەنانەت بە بێ لەرزینێک
نەکا ترس لە دڵم گەڕێ.

دەستت بە دەم دڵدانەوە
سارد بۆوە لە ناو دەستمدا
رووح سووک، لە گەڵ خۆیدا بردمییە ئەو دونیای تر
تا ئاشنای مەرگم بکا.

جارانیش هەر وەک پەرەستار
دەستی بچووکت دەگرتم و
لە گەڵ خۆتدا منت دەبرد

تا لە گەڵ ژین ئاشنام بکەی

نەکا ترس لە دڵم گەڕێ

دێم بە شوێنتا

بۆ ئەو هەرێمە خامۆشە

بە متمانەیەکی منداڵانەوە

بۆ ئەو شوێنەی بەر لە من چووی

با هەست بە غەریبی نەکەم

ئیتر من هەرگیز ناهێڵم

کە ترس لە دڵم گەڕێ.

## ڕێگا

چ ترسم هەیە ئەگەر پێشێلم بکەن

وەک گژ و گیا؟

چارەنووسی خۆڵی پێشێل کراو

بوون بە ڕێگایە و

ڕۆیشتن...

# توانا

هێند بە توانام
هیچم نییە لێم بستێنن
هیچم نییە لە ترسی لە کیسچوونی بشلەژێم
هیچم نییە لە بێدەنگیدا حەشاری بدەم
یان سەرتاپێ لە ترسی لە کیسدانی ببمە چاو
دەتوانم بێخۆف راوەستم
رووبەڕووی هەموو بایەکانی جیهان

هەستن ئەی بایە توندەکان،
قەمچییەکانتان بە سەر من دابهێننە خوار.
چم هەیە بە تالان بچێ؟
هیچ شتێک لەگەڵ خۆم نابەم
هەتاکوو تێکم بشکێنن
هیچم گەرەک نییە بۆ خۆم
هەتا بە چۆکم دابێنن

هیچم وەسەر یەک نەناوە
هەتا کۆتوزنجیرم کەن.

ئێستاکە ئەمن ئازادم
بە باڵ و خولیای رەهاوە
زۆر بە توانام
بۆ لە ئامێز وەرێنانی هەموو شتێک

ئەتۆش دونیا!
هەرچی زیاترم لێ بستێنێ
زیاتر لە چنگەکانم دای.

ئەودەمەش کە
دەستم بشۆمەوە لە خۆم
ئەتۆ دەبی بە ملکی خۆم.

# راستەقینەی من

ئەگەر لە ژیانی ئەمندا

پیاوێک بووبێ خۆشی بوێم

لە بەر خەرمانی زێڕینی بسکەکانم و

بەرامەی عەترئاسای لەشم

(من کارئاسکێکی سلۆکم)

کەواتە خۆشخەیاڵ

دڵی بە راستەقینەی- با- خۆش کردووە

بەڵام ئەگەر جار ناجارێک

یان هەر جارێک

پیاوێک بووبێ خۆشی ویستبێم

بە تەنیا لە بەر خەفەتم

لە کوتننەهاتوو و نادیار

بەچەشنی خەفەتی قومری

کەوایە ئەو

دڵی بە راستەقینەی ئەمن خۆش کردووە و

ئەویندارانە حەزی لێکردووم.

# ئەزموون

هیچ هێمایەک نەماوەتەوە

لەو هەمووە جەژنە بەشکۆیانەی مێژوو

هەموو شتێک تەفر و توونا دەبێ

ئەوەش کە ئێمە بە هەرمانی دەزانین

لە هەمووان تەفرو تووناتر...

دۆستایەتی

ناوبانگ

دەسەڵات

سەرکەوتن

زاڵبوون

تەنیا ئەو شتە تورت و خۆنەگرە دەمێنێتەوە:

نیشانەی قووڵی زامێک کە ئەوین بەجێی دێڵێ.

# بێدەرەتانی

چاوەڕوانی سبەینێی

چاوەڕوانی یەستا

بەڵام،

رەنگە.

چاوەڕوانی ئەوەی وا لە ناختدا

سەوزەگیا چاوەڕوان نابێ

هەتاکوو بەرد هەڵپرووکێ،

هەر بۆ خۆی درزی تێدەخا.

بەردیش ناچار

رێی پێدەدا

چون لێواو لێوە لە بێدەرەتانی،

لە رووان

لە پشکووتن.

# بۆ بیرەکانمان

بۆ بیرەکانمان
هەتا ئاخرین رادەی بەرزایی
شوورەی چیمەنتۆی هەور بڕ...

بۆ دەربڕین
هەتاوەکوو دوایین رادەی شاراوەیی
پەردەی ئاسنین و حەوت قوفڵی ئاسنین

بۆ بزووتن
تا ئاخرین رادەی گەمارۆ
سلوولی لە چەشنی کەندوو

بۆ خەیاڵات

ئەگەر هێشتاش هێز و گوڕێکیان تێدابێ

بەرینایی شوورەی بە بێ پەنجەرە

فەزا

بێسنووری بەسام

پێش ئەوەی کە تێی بگەن

ئێمە لەوێ دەبین

درەوشاوە

بەو روناکاییەی لە خۆمانەوە بڵاویدەکەینەوە..

# لە سووچی ئەوینێکی تازەدا

هەر ئەوینێکی نوێ دەستی شەلاڵی خوێنە
بێ ئەوەی دەستی بلەرزێ
هەموو ئەوینەکانی پێشوو لە خوێندا دەگەوزێنێ

ئای بە چ بزەیەکی بێگەردەوە
خەنجەر دادێنێتەوە بۆ سەر پشتی
یەکەمین و دوامین و تاقانەترین ئەوین

لە هەموو شوێنێک هاودەستی هەیە:
لە ئوتووبووسێکدا کە درەنگ دەگاتێ.
لە تەرزەیەکی کوت و پڕیشدا
هەروەها لە هەزار سووچ و قوژبنی دی

هاندەری تاوانەکەشی ئازادیی‌یە.

ئەو وادەی ژوانە وەک لە خۆ درەباز بوون دەچێ
ئەو سەفەرە-شەقڵی پێیەکە دەنوێنی
ئەو شوێنەی کە مەرگ بە جلی گۆڕاوەوە ئامادەیە

ئەوکاتەش کە ئەوینێک کۆن دەبێ
خەنجەرێک لە کەمین دایە
لە سووچی ئەوینێکی تازەدا

ئەتۆش تێدەگەی کە ئەوین
لە ئاسەوارەکانی زەمانە و -
دەبێ بەردەوام کاژ فڕێ بدا و نوێ بێتەوە و نوێتر

# داگیر کردن

مەرگ دەچۆڕێنمە هەناومەوە
ئەوین لە دوامین روانینندا.

بە شەپۆلێک لە ژان و
رزگاری
هێرش دەکەمە سەر هەستم
خووی پێدەگرم
بە قەت ژیان.

دەبێتە هەموو دار و نەدارم
بۆ هەمیشە دەبێتە هی من.
کەس ناتوانێ داگیری کا
مەرگ، نامخاتە داوەوە
بە وادە و بەڵێن، یان ئەرک
بە هەستی تاوانباری یان بە تەفرەدان
ئەو سەرنجام
بەڵگەی ئازادی ئەمن وەدەر دەخا.

# رووبەڕوو

دانیشتوو بەرانبەری یەک
دەدوێین سەبارەت بە خاڵی سەرەکی
ئەگەر- لە لایەکی ترەوە- بە کردوە.

کێ راستەقینە دەبێژێ؟

وشەکان یان بێدەنگی
روانین یان دەنگ
دەست یان ئاماژە
ئارامش یان دڵەکوتە
دووری یان نزیکی

رووبەڕووی یەک دادەنیشین
پشت لە خۆمان
بە روخسارێکی بە کرێگیراو و
ئاماژەیەکی خێرا بۆ راستەقینە

ئێمە خاڵی سەرەکی حەشار دەدەین.

# پێوەندی

هێڵێکی سنووری هەموو شتێکی لێکردووە و
بە شتی ترەوەی گرێ داون

لق وەک کۆیلەی پێست
لەوڕا با و باران هەست دەکا.

ماسی پەپوولەکە تەیارە و
هەر لەو را تێدەگا لە گێژەنی شەپۆلەکان

دەریا، بەستراو بەکەنار
لەوڕا لە ئامێزی دەگرێ خاکی تینوو

من لە ناو پێستی ژنێکدا و
لەو را برین و لاواندن دەناسمەوە و

چەند سنوورەکانمان نادیارتر
تەنیاییمان بەربڵاوتر.

# بەستەڵەک

ڕۆژی گیراو، سەردەکێشێ
لە نێوان میلە بەفرینەکانەوە
هیچ چۆلەکەیەک، هەڵفڕین، ناتوانێ
بە بەرزاییی تێلدڕووی نێو ئاسماندا
تۆپەڵەی سەهۆڵ ڕێگەی گرتووە
لە گەرووی پڕ کڵپەی ئاو
لە هەنگاوەکانی ئێمەش لە سەر زەوی بەفراویدا
دەنگی خرمەی کۆت و زنجیر هەڵدەستێ

بۆ ئێمە تەنیا یەک ڕێگەی دەرباز بوون هەیە
لە زیندانی سپی زستان:
لە بەندی ئازادیدا بین.

# ئەو نیشتمانەی کە نییە

## سودرگران پێشەنگی بزووتنەوەی شێعری نوێی سوئێد و فەنلاند



ئیدیت سودرگران ساڵی ١٨٩٢ له بنەماڵەیەکی فەنلاندی– سوئێدی و لە چینی مامناوەندی، لە شاری سێن پیترزبوورگ پێتەختی ئەو کاتەی رووسیا لە دایک بوو. بنەماڵەی "سوودرگران" چەند مانگێک پێش لە دایکبوونی ئێدیت، بەرەو "رای والا" کە ئەو کاتە ئاواییەک بوو لە نزیک لووتکەی "کارلسکا" لە شەست کیلۆمیتری پێتەخت، کۆچیان کرد. ئەو دێیە لە سەر سنووری نێوان فەنلاند و روسیا هەڵکەوتبوو. بەڵام ئێدیت خوێندنی سەرەتایی خۆی لە "سەن پیترزبۆرگ" تەواو کرد.

سوودێرگران بە مێرمنداڵی تووشی نەخۆشی ئازارەباریکە بوو و زۆرتری تەمەن و ژیانی خۆی تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٢٣دا جوانەمەرگ بوو، لە نەخۆشخانەی تایبەتی سیلدارەکان دەژیا.

نەخۆشییەکەی شوێنی لە سەر بەشێکی زۆری شێعرەکانی داناوە، هەروەها ناوەرۆکی شێعرەکانی جگە لە نەخۆشییەکەی بریتییە لە مەرگ و رەنج و دڵتەنگی و کلۆڵییەکانی خۆی، بەڵام جاری وایە شێعرەکانی توێژێکی هیوا و شادی و لێوڕێژ بوون لە ئەوین بۆ ژیانی پێوە دیارە. "سودێرگران" چەندین زمانی دەزانی و لەگەڵ شێعری هاوچەرخی ئەورووپا بە تایبەت سەمبولیستەکان و ئێکسپێرسیونیستەکاندا ناسیاوی هەبوو. ئەو یەکێک بوو لە روخسارە هەرە دیارەکانی گرووپێک لە شاعیرانی سوئێدی– فەنلاندی کە لە سەرەتای دەیەی هەوەڵی سەدەی بیست، شێوازی مودێرنیسمیان لە شێعری خۆیاندا برەو پێدا، ئەویش لە کاتێکدا کە ئەم شێوازە دە ساڵ دواتر لە سوئێد رەچاو کرا.

بڵاوبوونەوەی هەوەڵ دیوانە شێعری "سودێرگران" بە ناوی"شێعرەکان" لە ساڵی ١٩١٦دا بە ڕووداوێکی گرینگ لە مێژووی شێعری سوئێدیدا دێتە ئەژمار.

لەو شێعرانەدا سودێرگران هەوێنی نوێی وەک ئەویندارانە-سێکس، تێگەیشتنی ئیشڕاقی و خەیاڵاوی و هەروەها هەستی بە سروشت پاراوی بە زمانێکی بەهێز و بەچێژ وێنا کردووە. ئەوەی شایانی لێوردبوونەوەیە ئەویە، کە هەر وەک چۆن لە وتەیەکدا دەڵێ شێوازی دەربڕینی ئەو لە شاعیرانی سوئێدی-فەنلاندی جیایە و لە باری فۆڕمەوە شێعرەکانی خاوەن فۆڕمێکی نامۆ و تازەن، لە باری ناوەرۆکیشەوە بە سەرنجدان بە شێعری ئەو سەردەمی ئەورووپا نوێکارییەکی سەرنجڕاکێش و پڕبایخی کردووە.

سودرگران ئەگەرچی جوانەمەرگ بووە و تەمەن مەودای ئەوەی پێ نەداوە ماوەیەکی زۆر لە بواری شێعر و داهێناندا چالاک بێ، بەڵام هەر لەو ماوە کورتەشدا چەندین بەرهەمی بە نرخی پێشکەش کتێبخانەی شێعری سوئێدی کردووە. بە شێوەیەک کە دەردەکەوێ لە ساڵی ١٩١٦وە تا ١٩٢٥ شەش کۆمەڵە شێعری بڵاوبۆتەوە. کتێبەکانی بە پێی ساڵی بڵاوبوونەوەیان بریتین لە:

شێعرەکان(١٩١٦)، بەربەتی، سێپتامبر(١٩١٨)، پێشخانیسوورەگوڵ(١٩١٩)، ڕوانینە پرشوبڵاوەکان(١٩١٩)، سێبەری داهاتوو(١٩٢٠)، ئەو نیشتمانەی کە نییە(١٩٢٥). دوایین کتێبی واتە ئەو نیشتمانەی کە نییە دوای مەرگی بڵاوبۆتەوە.

کاتێک شێعرەکانی لە "هێلسینکی" بڵاوبوونەوە زۆربەی رەخنەگران بە توندی هێرشیان کردە سەر و کوتایان. تەنیا لایەنگری شێعرەکانی خاتوونێکی رادیکاڵی لاو بە ناوی "هاگا رالسین" بوو کە شێعرەکانی ئەوی بە شاعیرانی لاوی فەنلاند دەناساند. ئیدیت سودرگران لە تەمەنی سیویەک ساڵاندا بە هۆی هەژاری و برسێتی و نەخۆشی ئازارەباریکەوە تەنگی پێهەڵچندرا و بە تاڵی و ئازارەوە ماڵئاوایی لە ژیان کرد. پاش مەرگی وەک پێشەنگی بزووتنەوەی نوێی شێعری فەنلاند و سوئێد ناسراو، وردە وردە ناوبانگی ئیقلیمگیر بوو.

سودێرگران لەمەڕ شێعرەکانی خۆیەوە ئاوا دەدوێ: "هیچ کەس ناتوانێ حاشا لەوە بکا نووسراوەکانم شێعرن. بەڵام نامهەوێ بڵێم شێعرەکانم کێشیان هەیە، من هەوڵم داوە هێندێ لە شێعرە سەربزێوەکان بخەمە قاڵبی کێش دارەوە و بەمجۆرە گەیشتوومەتە ئەو ئاکامەی کە من تەنیا لە رەهاییدا، واتە بە فڕێدانی کێشی شێعرە کە توانیومە لە وشە و وێنەکان کەڵک وەرگرم. شێعرەکانم دەبێ وەک چەپکە یادداشتێک چاویان لێبکرێ.

بەڵام لەمەڕ ناوەرۆکی شێعرەکانمەوە دەبێ بڵێم کە من دەرفەت بە ئاوەزم دەدەم ئەو شتەی هۆش دەینوێنێ گردوکۆ کاتەوە و رەنگ و ڕوویەکی هونەری بداتێ. متمانەبەخۆیی من لەوەڕایە کە تواناییەکانی خۆم دۆزیوەتەوە. شانم هەڵناگرێ خۆم لەوە چکۆلەتر کەمەوە کە هەم.

# رۆژی زوڵاڵی پاییزی

رۆژی زوڵاڵی پاییزی

نەخشاو لە سەر پانتای زێوینی دارستان

بە رووی هەموو دونیادا بزەی دێ

چ خۆشە بێ هیچ ئاواتێک، چوونە تویی لێڵی خەوەوە

تێر لە تەماشای گوڵ و ماندوو لە دار و دەون

تاجی سووری رەزیش لە بان سەرت بێئەژمارن

رۆژی پاییزیی ئیتر دڵی پڕ نییە

ئەنگوستە سەربزێوەکانی سارد بوونەوە و

لە خولیایدا

کلووە سپییەکانی بەفر بێوچان هەر دادەبارن.

# من

من بیانیم
لەو وڵاتەدا کە لەژێر قورسایی ئاوەکانی زەریا دایە
هەتاو بە بازنەی تیشکەکانی‌یەوە تێم‌دەڕوانێ و
هەواش لە دەستەکانمەوە دەچۆڕێ
پێم دەڵێن لە یەخسیری‌دا لە دایک بووم
هیچ روخسارێکی ناسیاو نابینم
داخۆ بەردێک بووم، تووڕ هەڵدراو بۆ بن گۆم؟
داخۆ میوەیەک بووم، قورس بۆ لقوپۆپی خۆم؟
لێرە لە ژێر دارێک
کە با بە گوێی گەڵاکانی‌دا دەچرپێنێ
چاوەڕوان وێستاوم
چۆن لە جەستەی خزی ئەو دارە سەر کەوم؟
دەمەوێ لە بەرزایی لقەکانی‌یەوە
چاو ببڕمە ئەو دووکەڵەی
لە کوانووی نیشتمانی دای و بابی خۆمەوە سەما دەکا.

# ئێمەی ژن

ئێمە ژنەکان، پێمان بە زەوییەوە بەندە
لە کۆترە باریکە دەپرسین چی لە بەهار گەرەکە
ئێمە باسکەکانمان لە لەشی رووتی سنەوبەر دەهاڵێنین
ئێمە لە داچۆڕانی هەتاویشدا
بە شوێن پەند و هێمادا دەگەڕێین

ئەمن پیاوێکم خۆش دەویست
بڕوای بە هیچ شتێک نەبوو...
ڕۆژێکی سارد بە نیگایەکی بەتاڵەوە هات
ڕۆژێکی قورسیش
کە فەرامۆشی شەقڵی تەوێڵی شکاندبوو ڕۆیی
ئەو منداڵەم– کە هەرگیز لە دایک نەبوو– لەوە...

# شەوانە کە هەوا خەریکە فێنک بێ

١

شەوانە کە هەوا خەریکە فێنک بێ

لە دەستی منەوە گەرما بخۆوە

دەستم خوێنی بەهاری لێدەتکێ

دەستم بگرە

باسکە سپییەکانم بگرە

دڵتەنگی شانە لاوازەکانم بگرە...

سەیر دەبوو

ئەگەر شەوێک، شەوێکی وەک ئەو شەو

قورسایی سەری تۆم لەسەر سینگی خۆم هەست بکردبایە.

٢

تۆ سوورە گوڵی ئەوینت

خستە ناو منداڵدانی سپی منەوە

سوورە گوڵی ئەوینت کە خەریک بوو سیس هەڵگەڕێ

بە دەستە داگیرساوەکانم دەگرم.

لەگەڵ تۆمە! سەرکردەیەک بە راونینی سەهۆڵینەوە

وەریدەگرم

ئەو تاجەی لە سەرمت ناوە
ئەو تاجەی سەرمی بەرەو دڵم خوار کردۆتەوە.

٣

ئەورۆ بۆ یەکەم جار گەورەی خۆمم دیت
هەڵدەلەرزی، ناسیمەوە
ئێستا تەنیا دەستە قورسەکانی
لە سەر باسکە سووکەکانم هەست پێدەکەم
بزەی پڕ زایەڵەی پاکم
ئازادی سەربەرزانەی ژنانەم چی بە سەر هات؟
ئێستا تەنیا چنگە توندەکانی
لەسەر جەستەم
کە خەریکە هەڵدەلەرزێ
هەست پێدەکەم
ئێستا دەنگی رەقی راستەقینە
لە خولیا تورت و ناسکەکانما دەبیستم.

٤

تۆ گوڵێکت دیتەوە

میوەیەکت دۆزییەوە

کانی‌یەکت دیتەوە

دەریایەکت دۆزییەوە

ژنێکت دیتەوە

رووحێکی زیندووت دۆزییەوە–

تۆ، بەڵی تۆ، ناهومێد بووی.

# ژنێ ئەوڕۆیی

من ژن نیم، بوونەوەرێکی بێلایەنم
من منداڵم، خانزادە یان بڕیارێکی بوێرانەم
من تیرێژی لێو بە بزەی هەتاوێکی سوور
من تۆڕێک بۆ ماسییە بە تەماحەکان
من"خۆشییەک" بە خۆشی هەموو ژنان
من هەنگاوێک بەرەو رێکەوت و تێداچوون
من بازدانێک بەرەو ئازادی و سەربەستی
من سرتەی خوێن لە گوێی پیاودا
من تەماحی رووح و دڵتەنگی و داکشانی لەش
من رێنوێنی بەهەشتێکی نوێ
من ئاورینگێکی گەش و بزۆز
من چۆمێکی قووڵ، بە لرفە بەڵام تەنک
من ئاور و ئەمن ئاوم،
لە پیوەندیدا
راست و
بێگرێ و
ئازاد.

# خوشکەکانی ئێمە

خوشکەکانی ئێمە

بە جلی ئاڵ و والاوە

وەستاو لە سەر گاشە بەردەکانی بەستێن

بە دەم گۆرانی کوتنەوە چاوەڕێن

خوشکەکانی ئێمە

بە ئاو و هەوای ناو زەمبیلەکانیان دەڵێن گوڵ

من بەڵام باسکەکانم لە خاچێک دەهاڵێنم و

شین دەگێڕم

سەردەمێک وەکوو گەڵایەکی سەوز ناسک بووم

ئاوێزان بە بەرزایی شینی ئاسمانانەوە

شمشیرێکی دوو دەم لەناکاو لە ناو دڵمەوە تێپەڕی

سەرکەوتوویەک لێوەکانمی داگیر کرد

تووڕەیی ئەو وەها ئاوێتەی میهرەبانی بوو

کە رووحی منی تێکنەشکاند

ئەو ئەستێرەیەکی درەوشاوەی لە تەوێڵمدا و

بە دەم دەنگی هەنیسکەوە منی لە دوورگەیەک جێهێشت

کە ناوی ساردی زستان بوو.

# دواهەمین گوڵی پاییزی

من دوایین گوڵی پاییزییم
لە ناو بێشکەی هاویندا راژاوم
لە بەرابەر بای شەماڵدا وەک کێشکچی راوەستاوم و
بڵێسە سوورەکان
لە سەر گۆنای سپیم سەمایان کردووە.

من دوایین گوڵی پاییزییم
لاوترین چرۆی بەهاریم لە رابردوودا.

سیسهەڵگەڕان بە چەشنی دوایین گوڵ دژوار نییە
من دەریاچەم شین و ئەفسانەیی هاتۆتە بەرچاو
ترپەی دڵی هاوینی مردووم بیستووە
پنجە گیای من هەر بە تووی مەرگ ئاوسن

من دوایین گوڵی پاییزییم
قووڵی جیهانی ئەستێرەکانی پاییز و
رِوونی ئاگردانە گەرمەکانی دوورە دەستم بینیوە

هەمیشە تەنیا گرتنەبەری رێگایەک سانایە
دەرِوازەکانی مەرگ دادەخەم
من دوایین گوڵی پاییزییم.

# ئەستێرەکان

که شەو رادەشکێ لە هەیوان رادەوەستم
لە ئاسمانی باغەکەدا
گوێ دەدەمە زەنازەنای ئەستێرەکان
ئەستێرەیەک رادەخوشێ و دەکووژێتەوە
بە پێی پەتی بە سەر سەوزاییەکاندا هەنگاو هەڵمەگرە!
باغی من فەرش کراوە
بە وردە ئەستێرەی شکاو.

# چاڵاوی ئاوێنە

چارەنووس کوتی: یا دەبێ سپی بژی، یان سوور بمری!
دڵم بڕیاری‌دا: کە سوور دەژیم
ئێستا لە وڵاتێکم کە هی تۆیە
وڵاتێک کە مەرگ نایگاتێ
تەواوی ڕۆژ لە سەر لێواری مەڕمەڕینی چاڵاو دادەنیشم
ئەگەر کەسێک لێم بپرسێ ئاخۆ بەختەوەری بیرەدا رابردووە
بە بزەوە سەر رادەوەشێنم:
بەختەوەری لە دوورە دەستە،
لەو شوێنەی وا ژنێکی لاو لێفە بۆ منداڵەکەی دەدوورێ
بەختەوەری لە دوورە دەستە،
لەو شوێنەی وا پیاوێک لە دارستاندا
کەپرۆچکە بۆ خۆی چێ‌دەکا
لێرە سوورە گوڵ

هەمیشە لە قەراغ چاڵاوە کەلاوڕێژەکان دەڕوێن

لێرە رۆژە جوانەکان

روخساری گەشاوەی خۆیان دەڕێژنە ناخی ئاوەوە

گوڵی گەورەش

جوانترین گەڵاکانیان لە کیسدەدەن و هەڵدەوەرێن.

# ئەو نیشتمانەی کە نییە

دڵم گیراوە بۆو نیشتمانەی کە نییە

چون لە ویستنی هەموو شتێک ماندوو بووم ئیتر

مانگ بە وتەی زێوینی خۆی

حیکایەتی وڵاتێک دەگێڕێتەوە کە نییە

وڵاتێکی وا کە لەوێ

گشت ئاواتەکان وەدی دێن

نیشتمانێک کە لەوێ هەموو زنجیرەکان دەپسێن

وڵاتێکی وا کە لەوێ

تەوێڵی داگیرساومان لە شەونمی مانگدا فێنک دەبێتەوە

ژیانی من هەر تراویلکە بووە

بەڵام ئێستا ڕێگای خۆم دۆزیوەتەوە

ڕێی گەیشتن بەو نیشتمانەی کە نییە

لەو نیشتمانەی کە نییە
دڵدارەکەم تاجێکی درەوشاوەی لە سەردا
دڵدارەکەی ئەمن کێیە؟
ئەستێرەکان بە دەم بریسکانەوەوە
وڵام دەدەنەوە: شەوی تاریک
دڵدارەکەی ئەمن کێیە؟
ناوی چییە؟
میچی ئاسمان بەرز و بەرزتر دەبێتەوە
منداڵیم لە مژێکی بێکۆتاییدا نوقم دەبێ و
وڵامی پرسیارەکەم نازانێ
بنیادەم بەڵام هەر تینووی زانایییە
باسکەکانی هەتا ئەوپەڕی ئاسمان درێژ دەکا
وڵامێک دەدرێتەوە:
من ئەو کەسەم خۆشت دەویست و
هەمیشەش خۆشت دەوێ.

سەرچاوەکان:

١-سودرگران، ادیت، سرزمینی که وجود ندارد، ترجمه نامدار ناصر، ناشر: Nordient؛Goteborg

٢-حسن‌زاده، فریده، شعر زنان جهان، انتشارات نگاه، تهران ١٣٨٣

## "مۆتسارتی شێعر" و سەرەتای دەربڕینێکی نوێ

## ویسواوا شیمبۆرێسکا



ویسـواوا شیمبورسـکا شـاعیری ناسـراوی لەهێسـتانی، دووی ژانوییـەی ساڵی ١٩٢٣ لە ئاوایی "بنین" هەڵکەوتوو لە رۆژئاوای لەهێسـتان لـەدایک بـوو. سـاڵی ١٩٣١ وێـڕای بنەماڵەکـەی روویـان کـردە شـاری گـەورەی "کراکـوو". ویسواوا هەر لەو شارە خوێندنی سەرەتایی و کۆتایی و زانکۆی تـەواو کرد. پاش وەرگرتنی بڕوانامەی لیسانسی کۆمەڵناسـی لـە زانکۆی کراکوو، سـاڵی ١٩٥٣چالاکی رۆژنامەوانی لـە حەفتەنامـەی "ژیـانی ئـەدەبی"دا دەسـت پێکـرد. شیمبۆرسکا تا ساڵی ١٩٨١ واتە تەمـەنی ٢٨سـاڵان، بـەڕێوەبردنی لاپـەڕەکانی شێعری ئەو حەفتەنامەیەی لە ئەستۆ بوو. هاوکات لـە گۆڤار و بڵاڤۆکـەکانی دیکەش‌دا رەخنەی شێعر و چیرۆکی بڵاو دەکردەوە.

ویسـواوا لـە سـەردەمی مێرمنداڵی‌یـەوە، دەسـتی‌کرد بـە شـێعر نووسـین. یەکـەم کۆمەڵـە شـێعری بـە نـاوی "بـەو هۆیەیـە دەژیـم" لـە سـاڵی ١٩٥١دا بڵاوکردەوە. پاش ئەو کتێبە چەند بەرهەمی دیکەشی بڵاو کـردەوە کـە بـریتین لە:

چەند پرسـیارێک لـە خـۆم(١٩٥٤)، هـاوار بـۆ بێتسـی(١٩٦٣)، مرۆڤـەکانی سـەر پـرد(١٩٨٦) و سـەرەتا و کۆتـایی(١٩٩٣). شیمبۆرسـکا سـاڵی ١٩٩٦ خـەڵاتی نـۆبێلی ئـەدەبیاتی پـێ بەخشـرا و بـەو شـێوەیە ناوبـانگی جیهـانیی وەدەسـت هێنـا. داوەرەکـانی خـەڵاتی ئـەدەبی نۆبێـل ناسـناوی "مۆتسـارتی شـێعر"یان پێبەخشیوە. واتـە کەسـێک کـە وردەکاری‌یـە زمانی‌یـەکانی لەگـەڵ هەڵپە و هەیەجانی بێتهۆوێنی ئاوێتە کردووە.

پاش وەرگرتنی خەڵاتی نۆبێل، شیعرەکانی بە ٣٧ زمانی جیهان وەرگێڕدران.

شێعری شیمبۆرسکا خاوەنی تایبەتمەندییەکی بێوێنەیە، بە چەشنێک کە پاش خوێندنەوەی چەند شێعر، دەتوانین لە نێو کۆمەڵێک شێعردا بیانناسینەوە. لە شێعری ئەودا هەموو شتێک کەسایەتی هەیە و هەموو کەسایەتییەکیش شاعیرانە بیری لێکراوەتەوە و نەخشێنداروە، بە جۆرێک کە دەتوانین بڵێین لە شێعری شیمبۆرسکادا هەموو شتێک سێبەری رەسەنایەتی وەسەر دەکشێ. روانینی ئەو بۆ شت، وشە و واتاکان، روانینێکی هەڵقولاو لە دیناوە؛ بە شێوەیەک کە دەیهەوێ هەموو شتێک سەرلەنوێ بدۆزێتەوە. شێعری ئەو لە دۆزینەوەی سەرلەنوێی ئەو جیهانەدا دەنووسرێتەوە و پێکهاتە وەردەگرێ.

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی دەربڕینی شیمبۆرسکا، ئەوەیە کە رووداو و کارەساتە رۆژانەکان دەکێشێتە پانتایی شێعرەوە. ئەو رووداوانەی کە ئێمەمانان هەموو رۆژێک لە گەڵیان دەستەوئێخەین، بەڵام بە سارد و سڕی لە پەنایانەوە رادەبرین و سەرنجیان نادەینێ. ئەگەرچی وردبوونەوە لە وردەکارییەکانی ژیان، یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شێعری ژنانەیە؛ بەڵام شیمبۆرسکا لەو تایبەتمەندییە ژنانەیە کەڵک وەردەگرێ، دەیقۆزێتەوە و لەو رێیەوە روانینێکی قووڵ بە سەر بچووکترین بەشەکانی ژیاندا دەسەپێنێ.

شیمبۆرسکا شاعیرێکی ئاکارخوازە و تەنز پێگەیەکی تایبەتی لە شێعری ئەودا هەیە. شێعری شیمبۆرسکا لە سەر بنەمای ئەزموونە زۆر و

زەوەنـدەکانی شـێعری عاشـقانەی لەهێسـتان هۆنراوەتـەوە. لـە بەرهەمـە جیاوازەکانی ئەو شاعیرەدا، بەرپرسایەتی لە بەرانبەر بابەتە ئینسـانی و ژانـە کۆمەڵایەتی‌یەکان، پلە و پایەیەکی بەرچاوی هەیە.

سـەرەنجام شیمبۆرسـکا سـاڵی ٢٠١٢ لـە ٨٩ سـاڵی‌دا و پـاش ژیـانێکی دوور و درێژ کۆچی‌دوایی کرد، بەڵام وەک کوتوویانە " ژیـان چ کورت بێ و چ درێژ/ ژیان‌نامە دەبێ هەر کورت بێ. " هـەر بۆیـە بـە خوێندنـەوەی شـێعرە جیاوازەکانی کە هەم دەربڕین و هەم فۆڕم و شێوەی چنینی وشـەکانی نـامۆ و تـازەن، ڕەنگـە زیـاتر کەسـایەتی و شـێوە ڕوانینـی تایبـەتی ئـەومان بـۆ دەرکـەوێ. لـە کۆتـایی‌دا سـەبارەت بـە شیمبۆرسـکا دەتـوانین بڵێـین کـە ئـەو شـاعیرە دەربڕینێکـی تـازەی شـاعیرانەی خسـتۆتە ڕوو کـە ڕەنگـە نـوێ بوونەکـەی بـۆ زۆر کـەس چیـژ بـەخش بێ و بـۆ زۆر کەسـی دیکـەش ببێتـە مایەی سەرسووڕمان.

# وتووێژ له گەڵ بەرد

تەق لە دەرگای بەردێک دەدەم
_منم ئیزنم دە بێمە ژوور
دەمەوێ بچمە ناختەوە و
بڕوانمە ئەو دەور و بەرە
وەکوو هەوا هەڵتمژم.

-_ بڕۆ-بەرد وا دەڵێ
من بە تەواوی داخراوم
تەنانەت ئەگەر لەت لەت بین
هەر داخراو دەمێنینەوە
تەنانەت گەر ببینە خیز
هیچ کەس بۆ ناخمان رێ نادەین.

تەق لە دەرگای بەردێک دەدەم
_منم، ئیزنم دە بێمە ژوور
هەر بە هۆی وردبینی هاتووم.
وردبینییەک کە تەنیا دەرفەتی ژیانە.

دەمەوێ بڕوانمە کۆشکەکەت و
پاشان بچمە دیداری گەڵایەک و تنۆکێک ئاو
زەمان کەمە بۆو ئیشانە
دەبوو مەرگاوی بوونم کاری تێکردبای.

من لە جسنی بەردم_ بەرد وا دەڵێ-
پێویستە هەر وا قورس بم
لێرە بڕۆ
من ئەندامی بزەم نییە.

تەق لە دەرگای بەردێک دەدەم
_منم ئیزنم دە بێنە ژوور
وەک بیستوومە هۆدە گەلێکی گەورە و چۆڵ لە تۆدا هەن
هۆدەگەلێکی نەبەدی، بە جوانی‌یەکی بێ کەڵکەوە
بێدەنگ، بێ خشپەی هەنگاوی کەسێک
دان بەوە دانێ
کە خۆت شتێکی وای لێنازانی.

هۆدە گەلێکی گەورە و چۆڵ! _ بەرد وا دەڵێ-

بەڵام لەواندا شوێنێک بوونی نییە
ڕەنگە جوان بن، بەڵام
بەدەر لە هەستی کورت و کۆڵی تۆ.
ڕەنگە بتوانی بمناسی، بەڵام قەت تەجرەبەم ناکەی
گشت دەرەوەم لە بەر چاوتە
بەڵام دەروونم ئاوەژوو.

تەق لە دەرگای بەردێک دەدەم
_منم ئیزنم دە بێمە ژوور
-بە شوێن دالدەیەکی هەمیشەییەوە نیم لە تۆدا
ڕۆژە ڕەش نیم
بێ خانولان نیم
پێمخۆشە سەرلەنوێ بگەڕێمەوە ئەو جیهانەی کە تێی دام
بە دەستی خاڵی دێمە ژوور،
هەر بە دەستی خاڵیش وەدەر دەکەوم.
پاشان بۆ سەلماندنی ئەوەی بۆ ساتێک
من لە تۆدا ئامادە بووم
جگە لە وشە گەلێک کە هیچ کەس نایانسەلمێنێ
هیچم نییە بە دەستەوەی دەم.

ئیزنت نییە بێیە ژووریَ -بەرد وا دەڵیَ-

هەستی هاریکاریت نییە

هیچ هەستێک جێگەی ئەو هەستە ناگرێتەوە

تەنانەت ئەگەر چاوێکی ئەوەندە تیژیش بدۆزییەوە

کە هەموو شتێک ببینیَ.

بە بیَ هەستی هاریکاری هەر بیَ کەڵکە.

ئیزنت نییە بێیە ژووریَ

تەنیا دەکریَ تۆزێک لەو هەستە

یان گەڵاڵەی سەرەتایی ئەو

یان هەر تەنیا بیرۆکەیەکت لێی هەبیَ.

تەق لە دەرگای بەردێک دەدەم

-منم ئیزنم دە بێمە ژوور

ناتوانم دوو هەزار سەدە

چاوەڕێی ئیزنی هاتن بۆ بارەگات بم.

ئەگەر تۆ بڕوام پێناکەی_ بەرد وا دەڵیَ-

لە گەڵا بپرسە _ هەر ئەوە دەڵیَ من کوتم

لە تنۆکی ئاو بپرسە_هەر ئەوە دەڵیَ کە گەڵا کوتی

لە کۆتایی دا لە تاڵی مووی سەرت پرسیار بکە

پێکەنین ئاوەڵام ناکا، پێکەنین، پێکەنینی توند
پێکەنینێکیش کە ناتوانم لە گەڵی پێبکەنم.

تەق لە دەرگای بەردێک دەدەم
_منم ئیزنم دە بێمە ژوور
-_من دەرگایەکم نییە-بەرد وادەڵێ-

# سواری کەشتی نووح بن

بارانێکی بە خوڕەم دای دا، سوار بن،
چونکە جێیەکتان نییە پەنای بۆ بەرن
ئەی شێعرە تاکدەنگەکان
هەستە وەجۆش هاتووە تایبەتەکان
توانایی‌یە بێکەڵکەکان
وردبینی‌یە بێهۆیەکان
ترس و لەرزە کەم خایەنەکان و
تۆ ئەی ئیشتیای دیتنی شتەکان لە شەش لاوە!

ئاوی چۆمەکان رادەبن و لرفەیان دێ
سوار بن:
عیشوە، جوانکاری و وردەکاری‌یەکان

هەڵوارتەی گەوجانە

نیشانە لە بیرکراوەکان

جۆرە بێ ئەژمارەکانی رەنگی خۆڵەمێشی

کایە بۆ کایە و

ئەسرینی دڵخۆشی

هەتا چاو هەتەر دەکا ئاو و ئاسۆ لە مژدا

سوار بن: گەلاڵە بۆ داهاتوویەکی دوور

دڵخۆشی هەڵقولاو لە جیاوازی

ستایشی باشترینەکان

هەڵبژاردنێک کە بە دوو سێ شت نابەسترێتەوە

پەژیوانی‌یەکی لەمێژینە

کاتێک بۆ بیرکردنەوە و

براو بەوەی

کە ئەوانە هەمووان رۆژێک بە کەڵک دێن

لە بەر ئەو منداڵانەی

کە ئێستاش هەر خۆمانین

کۆتایی ئەفسانەکان خۆشە

ئێرەش ناتوانێ کۆتایی‌یەکی دیکەی بێ.

باران لێی دەکاتەوە

شەپۆلەکان دەحەجمێن

لە ئاسمانی سامالْدا

هەورەکان دەبزوون و کل دەبن و

دیسانیش

وەک ئەو هەورانەیان لێدێ کە شیاوی ئینسانەکانن:

بەشکۆ و گاڵتەجاڕانە

وەک دوورگەی بەختەوەری

بەرخەکان

گوڵە کەلەم و

کۆنەی منداڵ

ئەو کاتەی لە ژێر تیشکی تاو خەریکە وشک دەبنەوە.

# شەوە شێعری شاعیرێک

ئەی خاتووخودای شێعر،
هاواری بینەرانت لێ ئەستاندووینەتەوە
ئەگەر کەسێک بۆکسۆڕ نەبێ دەڵێی هەر بوونیشی نییە
دوازدە کەس هاتوون
ئیتر کاتی ئەوە هاتووە دەست پێبکەین
نیوەیان هاتوون، چونکە باران دەبارێ
ئەوانی تر خزمی یەکن، ئەی خاتووخودای شێعر.

لەم شەوە پاییزیەدا، ژنەکان ئامادەی لەسەرخۆ چوونن
ئەوان وادەکەن، بەڵام تەنیا لە کێبەرکێی بۆکسدا
هەر لەوێیە دەکرێ شانۆی "دانتەیی" ببینی
هەر لەوێشە کە دەکرێ بچیە میعڕاج،
ئەی خاتووخودای شێعر-

بۆکسۆڕ نەبوون، شاعیر بوون
مەحکووم بوون بە دژواری "نورویدی".

بە هۆی بە شان و باهۆ نەبوون
لە کتێبی وانەکانی ئەدەبی قوتابخانەدا دەنوێندرێ
-ئەویش ئەگەر بەختت بێنێ-
ئەی خاتووخودای شێعر، ئەی ئەسپی باڵدار
ئەی فریشتەی ئەسپ ئاسا.

لە ریزی هەوەڵدا
پیرە پیاوێک خەونێکی شیرین دەبینێ.
ژنەمردووەکەی لەوەپێش راساوە و
کەیکی بەلاڵووکی بۆ چێ دەکا.
گڕەکەی ژێری دەبێ کەم بێ، دەنا کەیکەکە دەسووتێ.
با دەست بکەین بە خوێندنەوە، ئەی خاتووخودای شێعر.

---

- شانۆی ترسێنەر
- شاعیری دوورخراوەی لەهێستانی(١٨٢١-١٨٨٣)کە ساڵەهای ساڵ دوای مەرگی، شێعرەکانیان دۆزیەوە و لە دیتنیان، سەریان سوڕما.

# مرۆڤەکان لە سەر پرد

ئەستێرەیەکی سەیرە و مرۆڤەکانی سەر ئەویش سەیر.

لە هەمبەر زەماندا دەنوشتێنەوە، بەڵام بڕوای پێناکەن.

بۆ دژایەتی نواندنیان، ڕێوشوێنی تایبەتیان هەیە.

وێنەگەلێکی لەو چەشنە دەخوڵقێنن:

لە نیگای یەکەمدا شتێکی وا نییە.

ئاوێک دیارە.

یەکێک لە بەستێنەکانی وەبەرچاو دێ.

پاپۆڕێکیش دەبیندرێ، کە دژ بە ئاو، بە چەتوونی دەچێتە پێش.

لە سەر ئاوەکە پردێکە و مرۆڤەکان لە سەر ئەو پردەوە دیارن.

هەنگاوەکان بە پەلەتر وەبەر چاو دێن

چون ئەم ساتە

لە هەورێکی ڕەشەوە باران دادەکا

مەسەلە ئەوەیە کە دواتر هیچ شتێک ڕوونادا.

هەور ڕەنگ و سەنەمەی خۆی ناگۆڕێ.

بارانەکەش نە توند دەبێ و نە ئەوەشە لێیکاتەوە.

پاپۆڕەکە بە بێجووڵە، دەبزوێ

مرۆڤەکان لە سەر پردەکە رادەکەن
راست بەرەو ئەو لایە
کە پێشتر روویان تێکردبوو.

لێرەدا ناکرێ چاوپۆشی لە روونکردنەوەی زیاتر بکەم:
ئەمە هەرگیز وێنەیەکی بێخەوش نییە،
لێرە زەمانیان راگرتووە و
رێساکانی وەبەر چاو ناگرن.
هێزی کارتێکردن لە رەوتی رێکەوتەکانیان،
لە زەمان ئەستاندۆتەوە
گوێیان نەداوەتێ، سووکایەتییان پێکردووە.

لە بەر خاتری شۆڕشگێرێک–
کەسێک با ناوی هیروشینگێ تۆتاگاوا
(ئەو کەسەی کە سالانێک لەمەوبەر
جوانەمەرگ بوو)
زەمان هەڵەنگووت و کەوت.

رەنگە ئەوە تەنیا
لاسارییەکی بێمانا بێ.

لاساریيەک تەنیا بە قەت چەند کاکەشانێک
بەڵام بۆ ڕۆژی مەبادا شتێکی تریش وەک دەبینن
دەخەینە سەر ڕوونکردنەوەکەمان:

لێرە ڕێز گرتن لەو وێنەیە
شوێن وەرگرتن و سەرسوڕمان لە دیتنی
هەر لە نەوەکانی پێشۆوە
جار نا جارێ بووەتە باو.

هێندێ کەس هەن کە ئەوەشیان پێ بەس نییە
تەنانەت خرمە و ترپەی بارانیش دەبیستن
فێنکایی دڵۆپەکانی لە سەر مل و پشتیان هەست دەکەن

کە دەڕواننە پرد و مرۆڤەکان
هەر دەڵێی چاویان بە خۆیان کەوتووە
لە دەمی هەڵاتن بە ڕێیەکی بێکۆتاییدا-
کە هەرگیز کۆتایی نایە-
ڕێیەک بۆ تێپەڕین، تا ئەبەد.
هێندەش کەللە ڕەقن پێیان وایە
ئەوانە ڕاستین.

# کۆنینەناسی

دەی باشە مرۆڤی چارەڕەش!
پێشکەوتنێکی بەرچاو سەبارەت بە من دەستی داوە.

هەزارەکان رابردوون
لەو رۆژەی ناومت نا کۆنینەناسی
ئیتر پێویستم نییە بە خودا بەردینەکان و
بە کاولاش و نووسراوەی دیاری سەر تەوێڵیان.

نیشانم دە هەموو ئەو شتانەی هی تۆن،
من پێت دەڵێم کە تۆ کێ بووی.
قووڵایی هەموو قاپێکم نیشان دە
دەرکی هەموو شتێک، لەتکی ماتۆڕ
ئەستۆی شاشەی تەلەیزۆن
بەشێک لە کابڵ، پەنجەگەلی پڕش و بڵاو
تەنانەت کەمتر و کەمتریش

بە شێوەیەک

کە ئەو زەمان نەتدەتوانی بیزانی

دەزانم کە چلۆن بیرگە

لە کارەساتە سروشتییە بێ ئەژمارەکاندا وەخەبەر بێنم

شوین پێی هەمیشە دیارە

درۆ دەدرەوشێتەوە

پیتی نهێنی بەڵگەکان دەنگ دەدەنەوە

مەبەستەکان و دڕدۆنگییەکان دەردەکەون.

ئەگەر تەنیا بمهەوێ

(چون سەبارەت بەوەی دەمهەوێ

نابێ هەمیشە متمانەت هەبێ)

بڕوانمە گەرووی بێدەنگیت

لە پیاڵەی چاوەکانتدا دەخوێنمەوە

بەرجەوەندەکانی داهاتووی ئەتۆ

بە هەموو وردەکارییەکانیەوە وەبیر دێنمەوە

لە ژیاندا چاوەڕێی چ بووی جگە لە مەرگ؟

نیشانم دە
ئەو هیچ شتەی
کە لە پاشت بە جێماوە،
دارستان و ئوتووبانی لێ چێدەکەم
فڕگە، هیچ و پووچی، میهرەبانی و
ماڵی لە کیسچووش هەروەها.

شێعرە بچووکەکەتم نیشان دە
من پێت دەڵێم
بۆچی نە زووتر نە درەنگتر بەدینەهاتووە.

نا! خراپ لە من گەیشتووی
ئەم کاغەزە قوڕە بە پیت داپۆشراوە
هەر بۆخۆت
مستێک لە خۆڵەکەی تۆ و
بۆنی بەجێماوی سوتماکی عەیامە کۆنەکان
بۆ من بەسە.

# قەڵچۆی سەدە

بڕیاڕ وابوو ئەو سەدەی بیستەمەی ئێمە، لە پێشوو باشتر بێ

ئیتر دەرفەتی نییە ئەوەمان بۆ بسەلمێنێ

سالآنێکی یەکجار کەمی ماوە

هێور هێور دەچێتە پێش

ئیتر کەوتۆتە ئاویلکە.

دەرد و بەڵای زۆری بەسەر هاتوون

ئەوەی کە بڕیاریش بوو روو بدا

رووی نەداوە.

بڕیار بوو رووی لە بەهار بێ

بۆ وێنە رووە و بەختەوەری .

بڕیار وابوو ترس، لە شاخ و دۆڵەکان بارکا

بڕیار وابوو راستی زووتر لە درۆ بگاتە مەبەست

بڕیار وابوو چەرمەسەری و رۆژە ڕەشی
وەک شەڕ و برسێتی و شتی تر
قەت خۆ دەرنەخەن.
بڕیار وابوو
حورمەتی بێ خان و لانی خەڵکی هەژار نەشکێنن و
متمانە و بڕوا و شتی واش.

ئەوەی دەیهەویست لە دونیادا شاد بژی
ئەرکێکی دژوار بەرەوڕووی بۆتەوە.
گەمژە بوون بۆ بزە نابێ
حیکمەت شادی بزوێن نییە.
هیوا
ئیتر ئەو گەورە کچەی پێشوو نییە و
شتی تر و شتی تریش بە داخەوە.
بڕیار وابوو سەرەنجام خودا ئیمان بێنێ
بە مرۆڤی باش و بە توانا
بەڵام ئێستاش کە ئێستایە
باش و توانا
هەر دووکەسن.

دەبێ چۆن بژی؟- لە نامەدا کەسێک ئەوەی لە من پرسی
کە منیش بۆخۆم دەمهەویست
هەر ئەو پرسیارە لەو بپرسم.

هەر وەک پێشتریش باسمانکرد
دیسانیش و وەک هەمیشە
پرسیارێکی پێویستتر لە پرسیاری گەمژانە دەست ناکەوێ.

# پیواز

پیواز شتێکی دیکەیە
دڵ و ریخۆڵەی نییە
هەتا ناخی ناخی هەر پیوازە
هەتا رادەی پیواز بوون
پیواز بوونی لەدەرەوە
هەتا پنج و رەگ پیواز بوون.
پیواز دەتوانێ بێ دڵەراوکێ
بڕوانێتە دەروونی خۆی.

دڕندەیی و نامۆیی لە ئێمەدا پەرەیان گرتووە و
پێستمان بە زەحمەت روویانی داپۆشیوە،
دۆزەخێک لە تان و پۆی دەروونی لە ئێمە دایە
ئاناتۆمی‌یەکی پڕ شۆر
بەڵام بە جێی ریخۆڵەی پێچەڵاوپێچ
لە پیوازدا
تەنیا هەر پیواز دەبینرێ.
پیواز سەد هێندە رووتترە
تا قووڵایی لە خۆی دەچێ.

پیواز، بوونێکە بە بێ دژوازی
پیواز، دیاردەیەکی سەرکەوتووە.
توێژێک لە ناو توێژێکی تردایە، بەو ساکاری‌یە
گەورەتر بچووکتری لە ئامێز گرتووە
لە توێژەکەی تری‌دا هاژەی دێ، واتە سێهەمی و چوارەمی
*فووگی مەیلە و ناوەند
زایەڵەیەک کە بەرە بەرە دەبێتە کۆڕ.

پیواز، ئەوە بوو بە شتێک:
نەجیب‌ترین جیهان
لە دەورەی خۆی خەرمانەی پیرۆز دەتەنێ
بۆ شکۆی خۆی.

لە ئێمەدا
بەز، دەمار، رەگی سوور و
هێڵی خوێن و...

سەرشێتی کامڵ بوونیشیان
بە ئێمە رەوا نەدیوە.

---

*قەتعەیەکی مووسیقی لە سەر بنەمای چەند دەنگی یان پۆلی‌فۆنی.

# ئەوین لە هەوەڵ نیگادا

هەردووکیان پێیان وایە
کە هەستێک لە ناکاو پێکەوە گرێی داون
متمانەیەکی وا جوانە
بەڵام دڕدۆنگی جوانترە

چونکە پێشتر یەکتریان نەدەناسی
بە گومانیان قەت هیچ پێوەندی‌یەکیان نەبووە
بەڵام بۆچوونی شەقام و پلیکان و ئەو ڕێیانەی
کە ئەم دووانە لە ساڵانێکی پێشوودا
لە پەنای یەک لێی ڕابردوون
دەبێ چی بێ؟

پێم خۆشبوو لێیان بپرسم
داخۆ وەبیر دەهێننەوە
ڕەنگە لە نێو درگایەکی نیوەئاوەڵا
بۆ ساتێک ڕووبەڕووی یەکتر؟

یان گوتنی "ببوورن"ێک لە ناو قەرەباڵغی خەڵکدا؟
یان دەنگی "ژمارەکەتان هەڵەگرتووە" لە ناو تەلەفوونەکەدا؟

-بەڵام وڵامیان دەزانم
نا، هیچیان بیر نایەتەوە

رەنگە زۆریان پێ سەیر با
ئەگەر بیانزانیبایە
ماوەیەکی درێژخایەن
گەپجارێک بوون
لە دەستی رێکەوتەکاندا.

هێشتا تەواو تەیار نەبووە
بۆیان ببێتە چارەنووس
کەچی لێکی دوور و نزیک دەکردنەوە
یان رێگەی پێدەگرتن و
بە بزەیەکی بزۆزەوە
تێدەپەڕی.
نیشانە و هێماگەلێک دەبێ هەبووبێ

-هەرچەندە لیڵ-

ڕەنگە سێ ساڵ لەمەوبەر

یان سێشەممۆی ڕابردوو

گەڵای دارێک لە سەر شانی یەکیانەوە

هەڵفڕیوە بۆ سەر شانی ئەوی تریان.

ڕەنگە یەکیان شتێکی لێ ون بووبێت

ئەویتر دیتبێتیەوە و هەڵیگرتبێ.

چووزانم؟ و کێ دەزانێ؟

بڵێی تۆپێک لە ژێر نسێی بڕەکانی منداڵی نەبووبێ؟

ئاڵقەڕێز و زەنگی دەرگای واهەبووە

کە یەکیان دەستی وێیکەوتووە،

ساتێکی دی ئەویتریان

جانتاکانیان لە پەنا یەک لە عەمباردا

ڕەنگە شەوێک هەردووکیان خەونێکیان دیبێ

کە پاش هەستان خێرا لە بیر چووبێتەوە

لە ئاکامدا

هەر دەستپێکێک

تەنیا هەر درێژەیەکە و
کتێبی ڕێکەوتەکانیش
هەمیشە هەر لە نیوەڕا دەکرێتەوە.

# دیمەنێکی(رازاوە) بە دەنکێک خیز

ناوی دەنێین دەنکی خیز
بەڵام ئەو نە خۆی بە دەنک دەزانێ و نە خیز
بە بێ ناوی زیندوویە
چ ناوی گشتی، چ ناوی تایبەتی
چ هەڵە، چ راست.

کاری نییە بە نیگاکانمان، ویک کەوتنمان
پێی وانیە تێی دەڕوانین و دەستی لێدەدەین
کەوتنی ئەو دەنکە لە سەر شووشەی پەنجەرە
رێکەوتێکە بۆ ئەو
نەوەک بۆ ئێمە

بە بڕاوی ئەو، کەوتنە سەر شووشە
لەگەڵ کەوتنە سەر هەر شتێکیتر وەک یەکە

بە بێ متمانە بەوەی کە ئاخۆ ئیتر کەوتووە

یان ئێستاش هەر خەریکە دەکەوێ.

لە پەنجەرەوە دەڕوانینە دیمەنی جوانی دەریاچە

بەڵام ئەم دیمەنە جوانە خۆی نابینێ

بێڕەنگ، بێ سەنەمە

بێدەنگ، بێبەرامە و

بێژان لەو دونیایەدا، بۆخۆی هەر بەردەوامە.

بنی زەریاچەکە، بنی نییە

بەستێنەکان، بەستێنیان نییە

ئاو نە تەڕە و نە وشک

ئەو شەپۆلانەی

بە دەوری خڕکە بەردی نە گچکە و نە گەورەدا

گێژدەخۆن

قەت لە دەنگی خۆیان ناگەن.

نە تاکن و نە کۆ.

ئەو هەموو شتەش

لە ژێر ئاسمانێک دایە کە ڕەنگە ئاسمان نەبێ و

لەوێ خۆری بە دوور لە رۆژئاوا ئاوا دەبێ و
بە بێ ئەوەی کە قەت خۆی حەشار دابێ حەشار دەدرێ.
لە پشت هەورێکەوە کە لە خۆڕا هاتووە.

-با- بێ هیچ هۆیەک جگە لە شنینەوە
هەورەکان بڵاو دەکاتەوە
چرکەیەک تێدەپەڕێ
دوو چرکە
سێ چرکە.

بەڵام ئەم سێ چرکەیە هەر بۆ ئێمە تێدەپەڕێ
وەکوو چەپەر، زەمان تێپەڕی، بە پەیامێکی گرینگەوە
بەڵام ئەوە تەنیا شوبهاندنی ئێمەیە.
کەسایەتی خەیاڵی و پەلە و هەڵەی داسەپاوی
بەڵام پەیامەکەی ئەو بۆ مرۆڤ نییە.

# کێڵ

لێرە نووسەرێک خەوتووە، عەنتیکە هەر وەکوو کاما
کە خاوەنی چەندین شێعرە
خاک بە گەورەیی خۆی، ئارامشێکی ئەبەدی پێ بەخشیوە
سەرەڕای ئەوەی مەیتەکە
ئەندامی هیچ کۆڕێکی ئەدەبی نەبووە
بەڵام هیچ شتێک جگە لەو مەتەڵە منداڵانەیە
گیای باوە ئادەم و کوندە بوو
لە سەر کێڵەکە نابیندرێ
کاکی ڕێبوار لە جانتاکەت مێشکی ئیلێکترۆنی بێنە دەر
بۆ ساتێکیش بیر لە چارەنووسی شیمبۆرسکا بکەوە.

# زیادی

ئەستێرەیەکی نوێیان دیتۆتەوە

ئەوەش بەو مانایە نییە کە دەور و بەرمان روونتر بووە و

شتێکی پێوە زیاد بووە کە تاکوو ئێستا نەبووە

ئەستیرەکە گەورەیە و لە ئێمە دوور

ئەوەندە دوور کە بچووکە

تەنانەت بچووکتر لەو ئەستێرانەی کە لەو بچووکترن

ئیتر لێرە سەرسوورِمان شتێکی سەیر نەدەبوو

ئەگەر دەرفەتمان بۆی هەبا

تەمەنی ئەستێرە، قورسایی و شوێنی ئەستێرەکە

رەنگە هەمووی ئەوانە بەس بێت بۆ تێزێکی دکتۆرا و

پەرداخێک شەرابی ناقابیل

لە کۆرە جێ متمانەکانی نزیک ئاسمان:

-ئەستێرەناس ژنەکەی و خزم و دۆستی
کەشوهەوایەکی خۆمانە
جلوبەرگی دڵخواز
قسەی خۆمانە زاڵ بە سەر قسەکانی تردا و
دیسان دەخورێ بادام زەمینی
ئەستێرە شتێکی سەیرە
بەڵام ئەوە نابێ ببێتە هۆی ئەوەی
بە سڵامەتی ژنەکانمان نەخۆینەوە
کە بێگومان لە ئێمە نزیکترن.
ئەستێرەیەکی بێئاکام
بێ ئەوەی کە شوێن دابنێ
لە سەر کەشوهەوا و
داب و مۆد و
ئەنجامی کێبەرکێ وەرزشییەکان
یان ئاڵوگۆڕی دەوڵەت و رادەی داهات و قەیرانی بایخەکان
بێ ئەوەی شوێن دابنێ لە سەر پیشەسازی قورس و پرۆپاگاندا
بێ ئەوەی کە دەنگ داتەوە
لە سەر لاکی ئەڵکۆڵی میزی وتوویژەکان
زیادی بۆو رۆژانەی لە ژیان ماوەتەوە.
لێرەدا بۆچی بپرسین

مرۆڤ لە ژێر چەند ئەستێرەدا لە دایک دەبێ

لە ژێر چەند ئەستێرەدا دەمرێ

پاش چەند ساتێکی کەمخایەن؟

ئەستێرەیەکی تازە دەرکەوتووە

-لانیکەم نیشانم بدە لە کوێیە.

-لە بەینی لێواری ئەو هەورە پچڕپچرە خۆڵەمێشییە و

ئەو لقە بچووکە ئەقاقیای، چەماوە بە لای چەپدا

-ئەها

-وڵام دەدەمەوە.

سەرچاوە:

١-شیمبورسکا، ویسواوا (١٣٧٦) آدمها روی پل، ترجمه مارک اسموژنسکی-شهرام شیدایی - چوکا چکاد، تهران: نشر مرکز

٢-شیمبورسکا،ویسلاوا (١٣٩١) شعر و زندگی شیمبورسکا، ترجمه محمد حسین بهرامیان، سارا شعر

ماریا بانووس لە دایک بووی شاری بوخارێستە و دەرچووی کۆلیژی ماف و ئادابە. تا ئێستا دە کتێبە شێعری بڵاو کردۆتەوە. هەروەها چوار شانۆنامە و کۆمەڵێک وەرگێڕان لە پێنج زمان وەک شێعرەکانی گۆتە، ریلکە، ڕێمبۆ و نێرۆدا لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئەون.

ماریا بانووسیش وەک نینا کاسیان لە شاعیرانی هاوچەرخی خۆی، نازناوی ژنە شاعیری نەتەوەیی ڕۆمانی وەرگرتووە.

## دەفتەری تازەی بیرەوەرییەکان

لێورێژ لە بیری پڕ و پووچ
دەفتەری تازەی بیرەوەرییەکان هەڵدەدەمەوە
گەڵا سپییەکان،-شەپۆلەکانی دەریا.
چاوەکانم لێک دەنێم و چاوەڕێی دەبم
بۆ یەکەم رۆژی دونیا
ئافرۆدیت بە لێوە تەڕەکانییەوە
پەرەنگی سووری ئاگر
گوێچکە ماسییەکی ئاوەڵا
شەرمێون، لێورێژ لە یەقین
راساو لە تەختی دەریاوە
لە گەمارۆی یەکەم قەوزەکاندا.
لە ژێر پێلووە لێکنراوەکان من چاوەڕێم.
دەکرێ ببیستی
ئاوازی خەماوی باڵندە دەرياییەکان
لە ژێر میچی کورتی ئاسمان
گرمەی بەردەوامی شەپۆلەکانیش
کە بێوچان
هەڵدەستن و دەنیشنەوە.

ئەگنێس ساڵی ١٩٢٢ لە شاری بوداپێست لە دایک بوو. خوێندنی لە لقی زانستە ئینسانییەکان و هەر لە زانکۆی بووداپیست تەواو کردووە. یەکەم کتێبە شێعری خۆی ساڵی ١٩٤٦ بڵاو کردۆتەوە. ئەگنێس جگە لە نووسینی شێعر نووسراوە و شێعری نووسەرانی ئەورووپی بە زمانی مەجاری وەرگێڕاوە.

# وەکوو زەینی سڕبووی داریک

هەڵدی لە ناو مێرگەکەدا

کراسێک، بە تەقڵەکوت.

لە تۆفانی بەهاریدا

لە تەنافی جلەکان خۆی دەرباز کرد و

ئێستا بەسەر زەمەندی سەوزا هەڵدەفڕی:

سەمایەکی چۆڵ لە جەستەی سەربازێکی برینداردا.

جلەکان گشت دەرباز دەبن

لە ژێر گڕی ترسێنەری بریسکەدا

دوایین هەڵمەتی ئەرتەشی ئاڵاکان و

مەلافەکان پەلە دەکەن، لوورەیەکی غەریب

بایەوانێکی دڕاوە، کۆنە پەڕۆ

لە بێکۆتایی مێرگی سەوزدا

شەل و کوت و زگ هەڵتۆقیو

گۆڕی بە کۆمەڵی جلەکانە

له‌ خۆمی حه‌په‌ساوم هه‌ڵده‌که‌نرێم
منیش هه‌ڵدێم به‌ دوویاندا
به‌ ئاماده‌بوونێکی هێندێک گه‌شتر و
به‌ ده‌ستێکی ئاوه‌ڵاوه‌
وه‌کوو زه‌ینی سڕبووی دارێکی مردوو
که‌ بانگ ده‌کاته‌ باڵنده‌ی هه‌ڵاتووی لقه‌کانی خۆی

ئێستا ئه‌وان ڕه‌په‌وڕوو ده‌که‌ونه‌ عه‌رزی و
هه‌موو ئه‌رته‌شی تێکشکاو
له‌ ناکاو هه‌ڵده‌ستێته‌وه‌ و باڵ لێکده‌ده‌ن
وه‌کوو نه‌خشێک له‌ زه‌ین‌دا
یان هه‌ڵفڕینێکی له‌ خوێن گه‌وزاو
له‌ پاش ده‌رچوونی گولله‌یه‌ک

له‌ پشته‌وه‌، له‌ ناو مێرگه‌که‌دا ئێستا
هه‌وای سه‌وز و ماتی چیمه‌ن
وه‌ک ئه‌وه‌ی بپارێته‌وه‌
ده‌ریاچه‌یه‌ک.

مایا ئانجیللۆ، شاعیر، چیرۆکنووس، ئەکتەر و دەرهێنەری ئامریکایی، ڕۆژی چواری ئاوریلی ١٩٣٨ لە "سەنت لوویس"ی پارێزگای "میسووری" لە دایک بوو و هەر لە سەنت لوویس و میسووریش گەورە بوو. ناوی ڕاستەقینەی مارگرێت جانسۆنە کە پاش دەورگێڕان لە یەکەم کاری شانۆیی کە لە "بارێک" بە ناوی "پیوازی ئەڕخەوانی" دەوری سەماکەرێکی دەگێڕا، ناوی خۆی گۆڕی و کردییە "مایا ئانجیللۆ". کاتێک سێ ساڵان بوو دایک و بابی لێکدابڕان و ئەو و براکەی کە ناوی بایلی بوو چوونە "ئێستامپس" تا لە لای نەنکیان بمێننەوە. بەڵام پاش ماوەیەک دەگەڕێتەوە لای دایکی. ئەو ماوەیەی کە لای دایکی دەمێنێتەوە، حەریفی دایکی دەستدرێژی دەکاتە سەر و مایا بە هۆی ئەو کارەساتەوە تا تەمەنی سێزدە ساڵان لاڵ دەبێ، بەڵام بە هۆی حەولی بەردەوامی ژنێک بە ناوی "فلاوێرز" بەرە بەرە چاک دەبێتەوە. یەکەم کاری ئەدەبی ئەو ژیاننامەیەکی لێوڕێژ لە هەستە بە ناوی "نازانم بۆ باڵندە دیلەکانی ناو ڕکە گۆرانی دەڵێن". ئەو کتێبە پاش ئەوەی بڵاو دەبێتەوە دەچێتە ریزی ئەو کتێبانەی رمێنی چاکیان لە بازاڕی فرۆشدا هەیە. مایا لەو کتێبەدا باسی جەبری تاراوگە و جەبری نووسین دەکات. دووهەمین کتێبی ئەو شاعیرە "بەناوی من لە دەوری یەک کۆ ببنەوە" بوو، کە باسی کەسایەتی خۆیەتی.

ژنێک کە مایا ئانجیللۆ لە هەناوی بەرهەمەکانیدا وێنای دەکا، زیاتر ژنانی ڕەشپێستی ئامریکایی دەگرێتەوە، چونکە بەردەوام لە شێعرەکانیدا حەولی ئەوە دەدا خۆی لە بازنەی ئەو ژنانە بێنێتە دەرێ کە کۆمەڵگا بە

شێوەیەکی زەق چاویان تێدەبڕێ و مەبەستی ئەوەیە لەو بارودۆخەدا ڕێگایەک بۆ دەربازبوونی خۆی لە داوی نیگای پیاوسالارانە بدۆزێتەوە. لە شێعری ژنی سەیردا، درەوشانەوەی ژنانە دەگاتە چڵەپۆپەی خۆی. ئانجێللۆ ئەو ژنە وەها لە چواچێوەی وێنەی شێعریدا دەنەخشێنێ، هەر دەڵێی تاقانە بەدیهێنەری ئەو سەر عەرزەیە. ژنی سەیری مایا ئانجێللۆ راستەقینەکان دەزانێ، دانیان پێ دادەنێ، بەڵام لە ئاست ئەو راستییانەدا سەر دانانەوێنێ. ئەو لەو شێعرەدا تەنیا سەرنجی نەداوەتە پیاوان، بەڵکوو ژنانی کۆمەڵگای خۆشی بۆ خۆیابوون و دەرکەوتنی ژنێکی ئاوا ئامادە دەکا.

کارنامەی ژیانی مایا بەو خەڵاتانە رازاوەتەوە:

خەڵاتی بەنرخی تۆنی بۆ دەورگێڕان لە شانۆکانی "ریشەکان" و "بزانە"دا. پاڵیوراو بۆ خەڵاتی پۆلیتزێر لە ساڵی ١٩٧٧دا، پاڵیوراو بۆ خەڵاتی "ئێمی" لەبەر دەرهێنانی زنجیرە دڕامای "ریشەکان". وەرگرتنی خەڵاتی نێودەوڵەتی کتێب لە ساڵی ١٩٧٠دا، وەرگرتنی خەڵاتی رۆژنامەوانی "ماڵی ژنان" لە ١٩٧٦دا، خەڵاتی ژنی ١٩٩٢، و وەرگرتنی دەیان دکتۆرای شانازی لە زانکۆ جۆراوجۆرەکانی جیهان.

کتێبەکانی بریتین لە:

نووسین:

١-دەزانم باڵندەکان لە رکەدا دەخوێنن(١٩٧٠)

٢-بە ناوی من لە دەوری یەک کۆ ببنەوە(١٩٧٤)

٣-گـــۆرانی کـــوتن و ســـەما کـــردن و وەک کریســـمس دڵخـــۆش بوون(١٩٧٦)

٤-دڵی ژنێک(١٩٨١)

٥-هەموو بەچکەی بنیادەمێک پێڵاوی سەفەری دەوێ(١٩٨٦)

کۆمەڵە شێعر:

١-هەر پیاڵەیەک ئاوی فێنکم دەنێ، خەریکە دەمرررررم (١٩٧١)

٢-دیسان رادەبمەوە(١٩٧٨)

٣- سۆفیلکەی ژن بۆ گۆرانی ناڵێی؟(١٩٨٨)

٤-کۆی هەموو شێعرەکانی مایا ئانجێللۆ(١٩٩٤)

شانۆنامە

١- کاباڕای ئازادی(١٩٦٠)

٢- کەمترینیان(١٩٦٦)

٣- ئاژاکس(١٩٧٤)

٤- دیسانیش رادەبمەوە(١٩٧٦)

وتارەکان:

١-تەنانەت ئەستێرەکانیش تەنیا دیارن(١٩٩٨)

# ژنی سەیر

ژنانی جوان هەر سەریان لەوە سووڕ ماوە
که نهێنی من لە چی دا شاراوەیە
ئەمن جوان نیم، جلکی باو لە من جوان نییە.
بەڵام کاتێک کە پێم کوتن
پێیان وابوو درۆ دەکەم.

من کوتم
لە بەرینایی دەستەکانمدا
لە پانایی سمتمدا
لە بەرزایی هەنگاومدا
لە هێڵی لێوەکانمدا ...

بە جۆرێکی سەیر
ژنم
ژنێکی سەیر
هەر منم.

چوومە ناو هۆدەیەکەوە

فێنک، هەر بەو جۆرەی تۆ پێت خۆشە

پیاوەکان لەبەرم هەستان

دواتریش بە چۆک داهاتن

پاشان

وەکوو پۆلێ زەردەواڵە دەورەیان دام

کوتم

ئاگری چاوەکانمە و

وریشەی ددانەکانم

نێو قەدی شووش و باریکم و

شادمانی لاقەکانم

پیاوەکانیش هەر سەریان لەوە سووڕماوە

کەچی لە مندا دەبینن

زۆر هەوڵ دەدەن بەڵام ناتوانن

دەست بە سەر نهێنی ناخمدا بکێشن و

بەڵام دەڵێین

هەر ناتوانن نهێنییەکانم ببینن.

دەڵێم

لە قووڵایی ناو قەدی باریکم دایە

لە نێو هەتاوی بزەمدا

لە لەرەی مەمکەکانمدا

یا لە شکۆی ئاکارمدا

بە شێوەیەکی سەیر

ژنم

ژنێکی سەیر

هەر منم.

جا ئەو جار دەزانی

بۆچی سەر دانانەوێنم

بۆچی هاوار ناکەم و هەڵیشنابەزم

یان نابێ زۆر بەرز بدوێم

کاتێک بە بەر دەمتدا رادەبرم

دەبێ بەو شتە خەنی بی.

دەڵێم لە خشپە خشپی پانیەم دایە

لە چینی بسکمدا

لە لەپی دەستمدا

لە ناز و نیونازی نیگامدا

چون بە جۆرێکی سەیر

ژنم

ژنێکی سەیر

هەر منم.

## عەشق

مامان و مردوو شۆرەکان دەزانن

لە دایک بوون چەند چەتوونە

مردنیش حەسانەوەیەکە و

ژیانیش ئەزموونێکی کورتە لە مابەینی ئەو دووانەدا

ئەی بۆ ئێمە بە بۆڵە بۆڵ

وەک ئەوانەی کە دەنگۆکان لە قاو دەدەن

لە نێوان ئەستێرەکاندا

هەر هەڵوەدا و دەربەدەرین

ئاخۆ بە شوێن بارستایەکی ون بوو داین

ئاخۆ ناوی ئەو بارستا ون بووە عەشقە؟

سەرچاوە:

١- دواچی، آزاده(١٣٩١) نگاهی به تصویر زن در اشعار مایا آنجلو، مجله الکترونیکی نصور

٢- شعر: سیاه زخم (یک روایت از زندگی مایا آنجلو) ترجمه محمد رضا فرزاد، مجله گلستانه

هانا گرزانیکهانس خەڵکی کۆماری چێکە. بە هۆی نالەباری باری سیاسی و گوشاری دەوڵەتی، ناچار بوو چێکۆسلۆواکی جێ بێڵێ و روو بکاتە ئۆستورالیا. ئێستا لە شاری سیدنی نیشتەجێیە. هانا بە سەر هەر دوو زمانی ئینگلیسی و چێکیدا زاڵە و بە هەر دوو زمان شێعر دەنووسێ. رۆژنامە رەسمییەکانی چێک بەردەوام شێعرەکانی ئەویان بڵاوکردۆتەوە. ئەو شاعیرە بە توانایە، تا ئێستا دوو کۆمەڵە شێعری بڵاو کردۆتەوە. شێعرە ئینگلیسییەکانیشی لە رۆژنامەکانی ئۆستورالیادا بڵاو دەبنەوە. هانا ئێستاکە ئەندامی ئەنجومەنی شێعری ئۆستورالیایە. دکتۆرای فەلسەفە و بروانامەی دیپلۆمی تیۆلۆژی هەیە و خاوەنی شەش منداڵ و شەش نەوەیە.

هانا لە شێعرەکانیدا حەوڵ دەدا یارمەتی هەستی جوانیناسانەی خەڵکی بدا. ئەو حەولی ئەوەیەتی یارمەیی خەڵک بدا هەتا جوانی لە شتە بچووکەکاندا ببیننەوە و لە راز و رەمزی هەستیی ورد ببنەوە.

بۆ وێنە لەو شێعرانەی خوارەوەدا لە سێ شت دەدوێ بە بێ ئەوەی لایەنە پێوەندیدارەکان بەوانەوە شی کاتەوە. سێ شت دێنێتە گۆرێ و شاعیرانە دەیانخاتە بەرباس کە بەو جۆرە باسلێکردنیان، گوتە لە هەرێمی شێعر دوور دەخاتەوە یان زمانەکە رەق و وشک دەنوێنێ. بەڵام توانایی شاعیرانەی هانا لەوە دایە کە لە شتی جاری وایە ناشاعیرانە شێعر ساز دەکات. لە شێعری یەکەمدا لە کاتژومێر دەودێ. بەڵام بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی و وردبینانە کە لە ناخی ئەو شێعرە و باقی شێعرەکانی تری هانادا بوونی هەیە، دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر هەڵوێستەیەک بکات و پاش ورد

بوونەوە بزانێ کە روانینێکی فەلسەفی لە پشت ئەو وشانەوە بوونی هەیە. هانا وەک زۆر بیرمەندی تر باسی گرینگبوونی زەمان دێنێتە گۆڕێ و وێڕای ئەوەش زوو تێپەڕی ئەو دیاردەیەش دەخاتە روو. زەمان وەک شتێک لە دەرەوەی مرۆڤ کە خەریکە ململانێ لە گەڵ ئینسان دەکات و عەزیزترین شتی لێ دەدزێ کە تەمەنێتی. فەلسەفەیەک کە لەسەر گەڕان و گۆڕانی زەمان و ژیان جەخت دەکات. خودی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە، بیرێکی تازە نییە، کە داهێنانی ئەو شاعیرە بیت، هەر لە ئەدەبی فارس‌دا زۆر شاعیری وەک حافز و خەیام و ... بە تەسەلی لە شێعرەکانیان‌دا گەڕان و گۆڕانی زەمانیان لە چوارچێوەی شێعردا خستۆتە بەرباس. بۆ وێنە هەزاران نموونەی وەک(بنشین بر لب جوی و گذر عمر ببین) ... (ئێمەی وەکوو خۆت ئەبەی سبەینێ خۆشت ... وەک ئێمە دەبی بە گۆزە لای بێخەبەرێ) و ... شاعیرانی کوردیش کەم و زۆر لە نالی‌یەوە تا بێخود و هێمن باسی دیاردەی زەمانیان کردووە و ململانێ‌یەکی کە لەگەڵ مرۆڤ هەیەتی.

بە گشتی هاناش لە شێعری کاتژومێردا ئەو باسە کۆنەی هێناوەتەوە ناو جەغزی شێعر، بەڵام هەم فۆڕم و هەم زمانی دەربڕینی تازە و سەرنج ڕاکێشن. لە لایەکی‌تریشەوە لایەنی شاعیرانەبوون و وێنەیی‌بوونی دەربڕینەکە بە سەر لایەنی ئەندێشەیی‌دا قورسایی دەکات و چێژێکی زۆر بە خوێنەر دەبەخشێ. لە سێ شێعرەکەی تریشی‌دا هەر کام بە شێوەیەک لە شتە بچووکەکانی تر ورد دەبێتەوە.

# کاتژمێر

دەڕوانمە کاتژمیر

بیر لە کات دەکەمەوە

دەدزێ لە من

بایخدارترین ساتەکانم،

ڕۆژەکانم و

سووچێک لە من

لەت لەت و دوابەدوای یەکدا

دەڕوانمە کاتژمێر

کات دەگەڕێ و

تەمەنی من بەرەو لای زەوی وەردەسووڕێنێ

بە چرکەچرکەی هێمنییەوە

ژیانم دەتوێتەوە

لە هەناسەکانی کاتژمێردا

# ڕابردوو

بەردینە پەیکەری کاتەکان

بە چێژی ژیانەوە دەکەونە لەرزە

وشەی جارێک کوتراو

لەو کتێبانەدا کە تۆزیان لەسەر دەنیشێ

وێنەی بڕست لێبڕاوی،

ئەوەی بە خوێن، داغ کراوە و لە بزووتنەوەشدا

بیرەوەری ئەو ڕۆژانەی کە زۆر ڕاستینە بوون و ئێستا نین

بزە و چێژ و فرمێسکەکان

تا هەتایە لە زەماندا ون بوون

ئاگایی و ئەو خەونانەی دەیان ویست هی من بن

هەموویان ڕەنگیان گۆڕا و ڕۆیشتن-

هیچ شتێک بۆ هەمیشە نامێنێتەوە

بڕکە بێ گیانەکانی بیرەوەری

تێکڕای ئەو شتەن کە بە میرات ماون

لە ڕابردووم.

# دڵۆپەی باران

دڵۆپەیەکی بچووکی باران گوتی:

"تکایە ئەی خۆری ئازیز! دەست هەڵگرە

گەرماکەی یەکجار بەتینە

لەوە زیاتر لەمن نزیک مەبەرەوە

زۆر دەترسم

رەنگە هەر بەزوویی مەفح ببمەوە و

تێدا چم"

بەڵام خۆرەتاو تێپەڕی و...

دووو باڵی پێبەخشی

هەتاکوو هەڵفڕێ

بەرەو تەشقی ئاسمانەکان.

# یاقیق

چۆڕایە سەر لەتکە بەردێک

بە ئەسپایی و نەرم و نیان

دڵۆپە ئەسرینێکی بە تەنیا،

لە چاوانی تەڕی ئەوینەوە

لەتکە بەرد، هەستی بە تین و تاو کرد

بۆ هەمیشە هەر لەو شوێنەدا مایەوە

لە سوورایی و سووتانێکی رازاوی‌دا

لە ئامێزێک لە بەرددا

ئاواتەکانی هەڵکۆڵی و لە پاش خۆی

شوێن پێیەکی بە جێ‌هێشت

لەتکە بەرد بوو بە شێوەیەک لە رەنگ و نوور و

ئێستاش دەنوێنێ ئاواتی مەحاڵی خۆی

ئەوین.

"کریستیەن فالکێن لەند" ساڵی ١٩٦٧ لە دایک بووە. ژیانی پیشەیی ئەو شاعیرە ساڵی ١٩٩١ و پاش بڵاو بوونەوەی یەکەمین کۆمەڵە شێعری دەستی پێکرد. تا ئێستا پێنج کۆ شێعری بڵاو کردۆتەوە. جگە لە کاری نووسین لە زۆریەک لە کۆڕەکاندا وتاری پێشکەش کردووە و شێعری خوێندۆتەوە. هەروەها بەشداری دەیان بەرنامەی تەلەویزیۆنی بووە. کریستیەن فالکێن لەند وەک یەکێک لە دەنگە ناسراو و کەسایەتییە هەڵکەوتەکانی شێعری سوئێد ناسراوە. ئەو لە شیعرەکانیدا حەولی داوە سەرلێشێواوی و ئاڵۆزی نەسلی خۆی بخاتە چوارچێوەی وێنە و وشەوە. نەسلێک کە بە شوێن دۆزینەوەی واتایەک بۆ تەنیایی و دۆزینەوەی شوناسی ونبووی خۆیدا دەگەڕێ. شێعری کریستیەن خاوەن دەربڕینێکی پچڕ پچڕ و نەفەس کورتە و لەو گشتە دابڕان و شوناسە کۆلاژ ئاسا و پچڕ پچڕە دەدوێ کە مرۆڤی هاوچەرخ گیرۆدەی بووە.

# بە ناخمدا تێدەپەڕی

دەبێ سەر بۆ من دانەخەی

مۆمەکان بە دەنگێکی مەزن و بە هێز شەهید بوون و

ئێستا هەر ئەوەی ماوە کە بیرنمەوە

ئەوەی لە چاوەکانمدا بە جێماوە.

کاتی ئەوە هاتووە بێدەنگ بم

لە ناخم دا تێدەپەڕی

کۆخەیەک لە کەللەمدا دەنگ دەداتەوە

لە شوینیکدا کە تەنیایە

من دەڵێم: لە زەردەوە تا زەرد

لێرە شتێک خەوتووە کە ناوێک شک نابەم لێی نێم

سوور بوونی پێشووی خۆمم بدەوە

بە نیگا منت دۆزییەوە

دەبێ پارێز بکەم لە درەوشانەوەی ئاشتی

## هەموو شتێک نوقم دەبێ

لێرە لەشێک نییە هەتا ئەشکەنجەی کەی
هەر لەو نێوەدا من بسووتێنە
جا ئەوجار کەمتر دەزانین
دەشتوانین یەکتر باشتر بناسین.

دەچەمنەوە لەشە شەتەک دراوەکانمان
ئیتر کاتی هەموو شتێک بەسەرچووە
بە بەتانی و ئامێزم گەرمت دەکەمەوە
تەوێڵت بە رۆن ئوتوو دەکەم
ئەوە زانستێکی رەشە
کەسێکی تر، جێی هێشتووە،
ئەتۆ رۆشتی

هیچ دەرفەتێک بۆ پاشەکشە نییە

ناو سەرم دەلەرێتەوە

بای مەرگ دەشنێنەوە هەمیسان

باسکەکانم ئاوەڵا کە

هەموو شتێک لە ناو خۆیدا نوقم دەبێ.

شەو شوێنی نووری داگیر کردووە

بۆنی تۆ کزتر دەبێ

بەروە هەر لایەکم رادەدی

# رازاوه له چاوتدا

لێگەڕێ سەر فەرمان بدا،
لێگەڕێ سەر یارمەتی بدا
بیرەوەری‌یەکان چڕ و پڕ دەبن
بە بێ هیچ خشڵ و زیوەر و رەنگێک.

نازانم دەبوو چ شتێک بزانم
راستەقینەم لە رەشایی بوێ:
دەستێک پڕ لە تاریکی‌یەکی زیاتر
تۆ لەشی من و منیش لەشی تۆ
ئیتر ئەمن ملکی تۆ نیم
تۆ هی خۆتی نەوەک هی من
هەناسەت لە مندا دەبزوێ بەردەوام
وریا لە شەودا، وریا لە تاریک و روونی بەیاندا.

دەزوو و تەنافی سوور، هەڵواسراون لە پێش چاوانم
شوێنێک دەست ناکەوی بۆ حەسانەوە
مرۆ دەمی دەبەستێ، سەری هەڵدێنێ

لێگەڕێ با قەشە بێ
لە ژووریێدا خول دەخوا
دەنگدانەوە و چاوەڕوانی
کات رچەیەک بەرەو ژووریێ ناکاتەوە
بێدەنگی هیچی لە جانتادا نییە
هەناسە قورس و قورس‌تر بووە
بە پشتی کۆم و نیگایەکی چرژاوەوە
روانیمە چاوە چرژاوەکانت

دەتوانم تۆ لە خۆم داپۆشم
دەتوانم خۆم برازێنمەوە لە چاوانتدا

## ئاسمان دەڕووخێ!

شتەکان رەش دادەگەڕێن: من نزیک دەبمەوە
هێشتوومە بمکەنە دوو بەش

تۆ لە لام نی
لە قوولایی رەشی چاڵدا

تەنیایی لەشی من
ئەو لەشی کە لەشی من بوو،
بە مۆر و مۆم و چوارچێوە و ئاڵقەڕێزەوە

لە خەوندا دەرگاکانت بە رووددا گاڵە دەدەم
رۆژەکانی حەسانەوە هەر درێژ دەبنەوە بە ڕیز
ناتوانم بگەڕێمەوە سەر ئەو خاڵە
ئەو گریانە هیچ تەنافێک وە جۆلانە ناخا
تەنیا تێکدەشکێ، و دادەڕووخێ
ئەو ئاسمانەی کە دەتتوانی
سۆمای چاوتی بە رووددا هەڵفڕێنی.

# برینی من لە لەت و کوتی کاتدا

بەرد لە سەر بەرد هەڵچنە لەو ترسەدا

شوێن و ناوەکان

زۆر لە مێژە من دەلەرزم
شوورەیەک لە خۆڵ و سەهۆڵ.
لێرە هیچ شتێک نابینمەوە.
لە رێی دەرباز بوون دەگەڕێم
پێستم لە دوور دەستەکانە
دەستە لەرزۆکەکان
بریقە دەدەنەوە وەک ئاسن.
سێبەر خەریکی حەسانەوەیە.
رووناکایییەک شک نابا هەتا ملی لەبەر مل نێ

بوومەتە هەڵمێکی زۆر کاڵ

سەرما هەر بەرەو سەرێ هەڵدەکشێ

ئەمن هەناسەبڕکەمە

رووبەر ئامادەی رووشانە.

لە لەت و کوتەکانی کاتدا

برینەکانی من خوێن دەدەڵێنن.

# دەمامکی کوڵکن

بۆوەی بتوانی دەبێ لە شوێنێک
کاتێکی زۆر بە ئەسپایی
مۆمێکی مردوو بە رووی چاوەکان‌دا وەک سەدەیەک.

ئێمە سەربەرەوخوار هەڵواسراوین
زەمانیش بە رواڵەت بە رێی خۆی‌دا دەڕوا

ئێمە سەر بەرەوخوار هەڵواسراوین
بۆ هاوڕێیەتی دەکەومە لێوە لەرزە
لێرە وەستاوم،
بێدەنگ لە پشت دەمامکە کوڵکنەکانەوە

مارگارێت ئەتوود ساڵی ١٩٣٩ لە وڵاتی کانادا لە دایک بووە. مارگارێت شاعیر، ڕۆماننووس، ڕەخنەگری ئەدەبی و نووسەرێکی فیمینیستە و تا ئێستا بە دەیان خەڵاتی بەناوبانگی پێبەخشراوە. حەوت جار تا خولی کۆتایی خەڵاتی (Governor General's Award) چووە و دوو جاریشی ئەو خەڵاتە بردۆتەوە. "پیاوکوژی کوێر" ناسراوترین ڕۆمانی مارگارێتە کە خەڵاتی "بووکێر"ی پێبەخشراوە. بەرهەمەکانی لە ٣٨ وڵات و بۆ سەر ٢٥ زمان وەرگێڕدراون.، جگە لە ڕۆمان لە بوارە جیاوازەکانی وەک کورتەچیرۆک و شێعر و ئەدەبی منداڵان و شانۆنوسیندا کاری کردووە. چەندین ساڵ ئەندامی سازمانی "لێبووردنی نێونەتەوەیی" بووە و ساڵانێکی دوور و درێژ بە دژی سانسۆڕی ئەدەبی چالاکی کردووە. ئەتوود خوێندنی زانکۆی لە لقەکانی فەلسەفە و زمانی فەڕانسەدا تەواو کردووە و شێعرەکانیشی سێبەری ئوستوورە و چیرۆکی پەریانی بەسەرەوەیە کە لە منداڵیدا هۆگرییەکی زۆری پێی بووە. تا ئێستا زیاتر لە ١٣ ڕۆمان و ١٨ کۆمەڵە شێعری بڵاو کردۆتەوە.

# وشەیەک کە تۆ دەپارێزێ

دەمهەوێ لە خەودا چاوت لێکەم
دەزانم رەنگە قەت ئەوە هەڵنەکەوێ
دەمهەوێ تێت بڕوانم لە خەودا
بخەوم لە گەڵت
هەتا بخزێمە نێو خەونتەوە
وەک شەپۆلێکی بزۆزی لێڵ
کە لە سەر سەرمەوە لەرەی دێ

لەگەڵ تۆ پیاسە بکەم
لە ناو دارستانی روونی
پڕ شەپۆلی گەڵا شین و سەوزەکاندا
هاوڕێ لەگەڵ هەتاوێکی تەڕ و
سێ مانگ
بەرەو ئەشکەوتێک کە دەبێ تێیدا دابەزی
هەتا ترسێنەرترین دڵە خورپەکانت

دەمهەوێ ئەو لقە زێوینەت پێ ببخەشم

ئەو گوڵە سپی‌یە بچووکە
وشەیەک کە تۆ دەپارێزێ
لەو خەفەتەی کە لە ناوەندی خەونەکانتدا دەژی

دەمهەوی وە شوێنت کەوم
هەتا سەر پلیکانەکان و هەمیسان
ببمە پاپۆڕیک کە بە ئاسپایی تۆ بەرەو دوا دەگێڕێتەوە
بڵێسەیەک لە جامەکانی نێو دوو دەستدا
هەتا لەو شوێنەی کە لەشت حەساوەتەوە
لە پەنای من
تۆش دەخزێیە ناوی‌یەوە
بە سانایی ئەو هەناسەیەی هەڵی‌دەکێشی.

دەمەوێ ببمە هەوا
ئەو هەوایەی تێی‌دا نیشتەجێ دەبی
بۆ ساتێکیش تەنانەت
دەمهەوێ هەر بەو رادەیە زیادی و
بەو رادەیەش پێویست بم.

# شێعرە نەنووسراوەکانی وڵاتی من

١

ئێرە، راست ئەو شوێنەیە
کە دەتهەوێ بیناسی
کە تێیداماڵۆچکەیەک ساز دەکەی و
بە بیریشت دانایە
شوێنێک کە سەرەنجام تێکتدەشکێنێ.
ئەو شوێنەی کە وشەی "بۆچی" وشک و
پووک دەبێ.

ئێرە قات و قڕی لێی داوە.

٢

ناتوانی هیچ شێعرێکی بۆ بنووسی
بۆو تابووتانەی کە زۆر کەس تێیاندا
نێژراون و
گۆڕەوشار دراون و
هێنراونەتەوە دەرێ،

که جێی ڕەنجی تاقەتپرووکێن
یەستاش بە سەر لەشیانەوە ماوە.
نە ساڵی ڕابردوو بوو نە چل ساڵ لەمەوەبەر،
حەفتەی پێشوو.
بڕیار بوو ڕوو بدا،
ڕوو بدا.
تاجە گوڵینەمان لە پێداهەڵگوتن بۆ سازکرد
وەک دەنکەکانی تەسبێح بژاردمان
لەو دەنکانە ژومارە و ڕەقممان ساز کرد و
دوعا و
پاڕانەوە.
ئەوانمان کردە شێعر، شێعری ئاوا.
کارساز نەبوو
ئەوان چۆن بوون، تا هەتا هەر وا مانەوە.

٣

ژنە لە سووچی ڕۆژئاوای تەختی سیمانیی هۆدەکە ڕادەکشێ
لە ژێر ڕووناکایی بێسنووردا
شوێنی دەرزی لە سەر باسکەکانی
هەتا لە هۆش خۆی بچێ و

سەریشی سوورڕماوە کە بۆچی دەمرێ.

دەمرێ، چونکە قسەی کردووە

لە بەر وشە دەمرێ.

ئەوە لەشی ئەوە،

بێدەنگ

بێ ئەنگوست،

ئەو شیعرە دەنووسێ.

٤

لە نەشتەرگەری دەچێ

بەڵام وا نییە

نا، تەنانەت بە پێچەوانەی ئەو لاقە کراوانە،

ئەو دەنگی ناڵە و خوێنە، جۆرێک لە دایک بوونە.

ئەوەش پیشەیەکە بۆخۆی

نواندنی کارامەییە

وەکوو سازادانی کۆنسێرتێک.

دەتتوانی باش بێ یاکوو چاک

بۆخۆیان دەیدرکێنن.

بۆخۆی هونەرێکە.

٥

ئەوە ناخۆشە، بە چاوی کراوەوە

لە تەنیشت هەتاوە.

ئێستا چی دەبینی؟

خەونێکی ئاڵۆز؟

خەیاڵات؟

یان رەنگە زیندەخەو؟

چ دەبیستی؟

ئەو تیغەی لە گلێنەکانەوە تێدەپەڕێ

هی فیلمێکی کۆنە.

بەڵام راستە و

دەبێ بتوانی تابشتی شایەتی بێنی.

راستییەکانی ئەو دونیایە بە روونی دەبیندرێن

لە مابەین فرمێسکەکانەوە،

ئەی بۆچی بە من دەڵێی

چاوەکانم ئیرادیان هەیە؟

بە روونی دیتن و گوێ پێنەدان

بێ ئەوەی خۆت لادەی

٦

لەو وڵاتەدا هەرچیت پێخۆش بێ دەتوانی بیڵێی
چونکە هیچ کەس، هەرگیز گوێت بۆ ڕانادێرێ.
تا دڵ دەخوازێ هێمنە و
دەتوانی بنووسی
ئەو شێعرەی کە قەت نەنووسراوە،
شێعرێک کە هیچ شتێک داناهێنێ
چونکە هەموو ڕۆژێک هەر خۆت دادەهێنی و
پاکانە بۆ خۆت دەکەی.
لە شوێنێکی تر، ئەو شێعرە داهێنان نییە.
لە شوێنێکی تر، ئەو شێعرە بوێری دەوێ.

ئەو شێعرە دەبوو لە شوێنێکی تر بنووسرێ
چونکە شاعیرەکانی ئیتر مردووون.
لە شوێنیکی تر، ئەو شێعرە وەها دەنووسرا
هەر وەک، لە وەپێش مردبێ،
هەر دەتکوت نەدەکرا کارێکی تر بکەی
یان شتێکی تر نەدەکرا بڵێی کە تۆ ڕزگار کا.
لە شوێنێکی تر دەبێ ئەو شێعرە بنووسی
چونکە کاریکی ترت لە دەست نایە.

# فەرهەنگۆک:

**ئازارە باریکە**: ئازاری سی، دەردەباریکە، سیل و دیق
**ئاژاوەگێڕ**: کەتنگێڕ، مایەفیتنە، شەڕ هەڵاییسێن
**ئاسیای بچووک**: ناوێکە کە یوونانی‌یەکان بۆ بەشی ئاسیایی وڵاتی تورکیا دەکاری دەکەن. سەرچاوە جیاوازەکان ئەو ناوچەیەیان بە ئاناتۆلی،وڵاتی رۆم، رۆمی بچووک و رۆمی رۆژهەڵات نێودێر کردووە.
**ئاکمەئیسم**: بزوتنەوەیەکی ئەدەبی بوو کە لە رووسیا سەری هەڵدا. نووسەرانی ئەو رەوتە دەستیان کرد بە رەتکردنەوەی شاراوەیی و رەمز و رازێک کە بەسەر دەربڕینی ئەدەبی ئەو سەردەمی رووسیا دا سێبەری چڕ کردبۆوە. ئاکمەئیستەکان پێیان وابوو بەرهەمی هونەری سەداسەد سەر بە دونیای هەستەکانە و دەبێ ئەو بەرهەمەمان خۆش بوێ. بە تایبەت بوونی سەرسوڕهێنەری ئەو هونەرە، واتە بوونی مرۆڤ و راستی‌یە دەروونی‌یەکانی ئەو(ئاخماتوا) بەرهەمە سەرنجڕاکێشەکانی کلتووری جیهانی، شار و کلیساکان(ماندلشتایم) گوڵ و گیا و بوونەوەرانی کێوی و پشکێنەرانی بوێر(گومیلیۆف) هێزەکانی سروشت(گرۆدتسکی) و ... هەموویان خۆشەویستن. گرۆدتسکی لە سەر ئەو رایە بوو کە دەبێ ناوی ئەو بزووینەوەیە بگۆڕدرێ بۆ "ئادامیسم"Adamisme واتە تێگەیشتنی پتەو و پیاوانە لە ژیان. ماندلشتایم لە سەر ئەو رایە بوو کە لە بووتیقای ئاکمەئیستی‌دا پلەی سەرەکی بە وشە بدرێ: وشە ـ وێنە، وشە ـ دەنگ، وشە ـ واتا.
**ئالکایۆس**: شاعیری گەورەی یوونانی کەونارا و خەڵکی دوورگەی لێزبۆس بووە. ئەو بە هۆی ناوبانگی بنەماڵە خانەدانەکەی و شێعرە بەرزەکانی وەک

پێشەنگی شیعری غەنایی یوونان ناسراوە. لە مێژووی ئەدەبیاتی یووناندا ئالکایووس بە شاعیرێکی بەد شانس ناوی دەرکردووە، چونکە لە گەڵ شاعیری بە توانا سافۆ هاوزەمان بووە. شاعیرێک کە ئەفلاتوون وەک دەهەمین ئەستێرەی هونەر ناوی دێنێ. ئالکایووس هاوالّی سافۆ بووە و وێڕای سافۆ لە جەنگەی شۆڕشەکانی دیموکڕاسی لێزبۆسدا بە تاوانی پیلانی سیاسی دژی پیتاکووس شاربەدەر کراوە.

**ئاڵووالا**: پارچەی ڕەنگاوڕەنگ

**ئاڵوگۆڕ**: گۆڕینەوە، پێکگۆڕینەوە

**ئامانجشار**: دونیایەکی کامڵ کە لە خەیاڵدا دەنەخشێندرێ، شاریخەونەکان

**ئاورینگ**: پڕیشکەی ئاوری وردیلە

**ئاوزەنگی**: ڕکێف، پلەکانی ئاسنی سەرکەوتنی خوانی زین

**ئەرخەیان**: خاترجەم، بێخەم، بێترس و دوودڵی

**ئەسپەندەر**: گیایەکە بەرێکی گزموولە دەگرێ و بۆ پووچکردنی چاووزار دەیسووتێنن

**ئووسیپ ماندلشتایم**: شاعیر و نووسەری ڕووسییە و ساڵی ۱۹۰٦ و لە تەمەنی پازدە ساڵاندا دەستی کردووە بە شێعر نووسین. خوێندنی سەرەتایی لە ڕووسییە و زانکۆی لە سۆربۆنی پاریس درێژە پێداوە، بەڵام پاش ساڵێک گەڕاوەتەوە پیترزبۆرگ. ناسیاوی ئەو لە گەڵ شاعیرانی فەڕانسەوی وەک فڕانسوا ڕۆلاند و وێرلێن و پورلاند هەر لەو ساڵانەوە دەستیپێکردووە. ساڵی ۱۹۱۰ بۆ دوو نیوساڵی خوێندن لە هایدلبێرگ خەریکی فێربوونی ئەدەبیاتی کۆنی فەڕانسە بووە. ساڵی ۱۹۱۱ لە زانکۆی شایانەی پیترزبۆرگ لە لقی زمانناسی ڕۆمانیایی خەریکی خوێندن بووە و هەرگیز ئەو دەرسەی پێ تەواو نەکراوە. لە ساڵی ۱۹۰۹وە دەستی کردووە بە چاپی شێعرەکانی لە گۆڤاری ئاپۆلۆندا و هەروەها لەو ساڵانەدا زۆر شێعری لە گۆڤارەکانی ڕووسیدا بلاوکردۆتەوە. لەو سەروبەندەدا لەگەڵ

ئانائاخماتووا ناسیاوی پەیدا دەکا و ئەو پیوەندی‌یە شوێنێکی کاریگەری لەسەر ژیانی ئەدەبی ئەو بووە. ئاخماتوا و ماندلشتایم و نیکلای ئیستپانۆویچ گۆمیلیۆف سێ هاوڕێ بوون کە تەواوی ژیانیان لێکهەڵنەبڕان. ساڵی ١٩١٣ کۆمەڵە شێعرێکی بەناوی "بەرد" بڵاوکردەوە. ساڵی ١٩٢١ بووە ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی رووس لە گورجستان و وەک ئەندامێکی کارا دەستی بە کار کرد. ساڵی ١٩٢٢ دوو کۆمەڵە شێعری بە ناوەکانی "سروشتی وشەکان" و "تریستان" بڵاوکردەوە. هەر لەو ساڵەدا و لە کۆڕی پرسەی لێنیندا لە گەڵ بۆریس پاستێرناک ناسیاوی پەیدا دەکا و ئەو ناسیاوی‌یە لە سەر کار و نووسینی ئەو کاریگەر دەبێ. سەرەنجام پاش تەمەنێک شێعر نووسین و چالاکی کاریگەر لە سەر ئەدەبی رووسییە ساڵی ١٩٣٨ بە هۆی خەمۆکی و راوەستانی دڵەوە کۆچی دوایی کردووە.

**ئێرسووس**: ئاوایی‌یەکە لە باشووری رۆژئاوای دوورگەی مەدەللی یۆنان. ئەو دوورگەیە نیشتمانی تێئۆفرێستس بووە و ماوەیەکیش سافۆ لەوێ ماوەتەوە.

**ئێرەیی**: بەخیلی، بەغیلی، حەسوودی

**ئیسترابۆن**: یەکێکە لە مێژوونووس و جوغرافی‌زانانی یۆنانی و کتێبی جوغڕافیایی ئەو تاقە بەرهەمێکە کە لە سەردەمی حوکمڕانی "ئاگوستووس" واتە ٢٧ی بەر لە زایین ماوەتەوە. ئەو لەو کتێبەدا باسی هەموو ئەو گەل و نەتەوانە دەکا کە یۆنانی و رۆمی‌یەکان ناسیویانن.

**ئیشتار**: لە ژیاری ئەکێدی‌دا، خودای ئاگاداریی خەڵک، ئەوین، بەروبوو، و هەروەها خودای شەڕ بووە

**بادەوە**: تۆف، کرێوە، باکوت

**بارگە تێکەوەپێچان**: خۆئامادە کردن بۆ سەفەر

**باس‌وخواس**: خەبەر، دەنگوباس

**باقە**: باوەشێک گیا یان دەغڵی بەسراو

**بانگ‌هێشتن**: بانگکردن

**بایەوان**: چادری سەر گەمی

**بڕست**: هێز، توانا، بڕس

**بڕکە**: پنجی بێستان

**بژوێن**: زەمەند، زەوی پڕ گیا و لەوەڕ

**بژیو**: مایەی ژیان

**بستەباڵا**: کورتەباڵا

**بلاوێن**: دڵخۆشکەر، دڵداری دەر

**بلیت**: پسوولە، پەتە، بیتاقە

**بە پیت و زەنگین**: بە بەهرە و دەوڵەمەند

**بە خوڕەم**: بە توندی، بە غوڕەم، بە توندی بارینی باران

**بەمرخ**:بەزەوق، بەتەماح، لەو دەقە دا مانای یەکەم مەبەستە

**بەدی**: با، بەی

**بەدیکراو**: لە پێشچاو، دیتراو

**بەرجەوەند**: دیمەن، لە پێش چاو ڕا دیار

**بەردەنووس**: نووسراوەی سەر بەرد، بەردێک لە سەری نووسرابێ

**بەرەژان**: ژانە درۆزنە، ژان هاتنی بەر لەوەخت، زاراوەیەکە بۆ گەیشتنی دەمە دەمی شتێک یان ڕووداوێک

**بەرەنگاری**: دەگژ ڕاچوون، بەرانبەری کردن

**بەرهەمهێنان**: ڕەنێوهێنان، پێگەیاندن

**بەروبوو**: بەهرەی زەمین، داهاتی زەمین، بەروبووم

**بەڵان**: بەڵام

**بەلەز**: بەپەلە

**بەلەسە**: وەپەلە کەوتوو، پەلە، لەز

**بەڵەک**: دووڕەنگ

**بەلەک**: ئەو بەشەی لاق کە دەکەوێتە نێوان ئەژنۆ و پێ، گۆشتی نێوان ئەژنۆ و پاژنە

**بەیدەست**: سڵ، قوشقی، وریا... ڕام، کەوی، تەسلیم، لەو دەقەدا دەستە مانای یەکەم مەبەستە

**بوختوننەسر**: ناوی چەند کەس لە پاشایانی بابیلە کە هەرکامیان ناوبانگێکی ئەفسانەیییان پێکەوە ناوە. بۆ وێنە یەکەمین هێرش بۆ سەر پەیکەرەی جووەکان(پەرەستگەی سولەیمان) لە ئۆرشەلیم و وێرانکردنی پەرەستگەکە و بەدیلگرتنی گەلی یەهوود بە کاری یەکێک لەو پاشایانە دەزانن. دەکارکردنی ئەو وشەیە بە شێوەی "بخت النصر" ڕاست نییە؛ چون ئەو وشەیە وشەیەکی عەرەبی نییە و لە زمانی عیبریدا بە واتای منداڵ یان بەندە و بەردەیە و نەسریش ناوی بوتێکە. بە پێی هەندێک سەرچاوەی ئیسلامی هۆی ئەو ناولێنانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە منداڵی بوختوننەسریان لە لای بوتێک دیتۆتەوە و باوکیان نەناسیوە، هەر بۆیە بە کوڕی ئەو بوتەیان لە قەڵەم داوە. تاقمێکیش پێیان وایە ئەو ناوە لە ئەسڵ دا بابیلییە و بەو شێوەیە بێژ دەکرێ:" نەبوو کوودووری ئووسەر Nabu-Kudurri-Ussur". لە سێ بەش پێکهاتووە. نەبوو: خاتووخودای زانستی بابیلە. کوودووروو: جێنشینی یامرزە. ئووسەر: واتە پشتیوانی بکە. واتە خاتووخودای زانستی بابیلی لە جێنشینی یامرز پشتیوانی بکە. بە بڕوای موسوڵمانەکان بوختوننەسر یەکێک لە زاڵمترین و خوێنڕێژترین پاشاکان بووە و لە بابێل پادشایەتی کردووە و لە زەمانی ئەرمیای پێغەمبەردا ژیاوە.

**بوێژ**: قسەکەر، ئەوکەسەی کوتوویە، شایەر

**بۆڕ لێدان**: بڕ لێدانی وەرەقی قومار، جیاکردنەوەی بڕێک لە وەرەقی قومار لە نێو هەموو وەرەقەکاندا

**بۆریس پاستێرناک**: (١٨٩٠-١٩٦٠) شاعیر و نووسەری مەزنی ڕووسییە کە لە ماوەی ژیانیدا بە دەیان خەڵاتی ئەدەبی پێ بەخشراوە. ناوبانگی ئەو لە دەرەوەی ڕووسییە بە هۆی نووسینی ڕۆمانی دکتۆر ژیواگۆیە، بەڵام لە ڕووسیا زیاتر وەک

شاعیرێکی مەزن دەیناسن. ناسیاوی ئەو لە گەڵ نوێنەرانی شێوازی هێماخوازی و فۆتۆریسم و یەک لەوان مایاکۆفسکی ڕێگای ئەوەی بۆ خۆش کرد شێعرەکانی لە گۆڤارە گرینگەکاندا، بۆ وێنە لە گۆڤاری لیریکادا بڵاوبێتەوە. پاستێرناک ١٠ کۆمەڵە شێعری بڵاوکردۆتەوە و لە یەکەمین کۆنگرەی نووسەرانی رووس لە ساڵی ١٩٣٤ دا وەک مەزنترین شاعیری هاوچەرخی رووسییە ناسێندرا. بەڵام چون شێعرەکانی تەنیا بە بابەتە کرێکارییەکانەوە نەدەبەستەوە، بە زوویی کەوتە بەر شەپۆلی رەخنە و پێداهەڵکوتنەکان جێگای خۆیان لە گەڵ رەخنەی توند گۆڕییەوە. ساڵی ١٩٤٦ پاستێرناک خەریکی نووسینی شاکاری ئەدەبی خۆی واتە رۆمانی دکتۆر ژیواگۆ دەبێ و لە ساڵی ١٩٥٧ لە ئیتالیا ئەو کتێبە بڵاو دەبێتەوە و لە ساڵی ١٩٥٨ دا لێژنەی داوەرانی ئەدەبی نۆبێل بە هۆی نووسینی ئەو رۆمانە خەڵاتی نۆبێل بە پاستێرناک دەبەخشن، هەرچەند پاستێرناک لە ترسی کاردانەوەی توندی رژێم و دوورخرانەوە و دەرکران لە نیشتمانەکەی ئەو خەڵاتەی رەت کردەوە و وەری نەگرت.

**بێ خانولان**: بێ ماڵوحاڵ، ئاوارە، رەبەن

**بێ سەنەمە**: بێ پێ و قەدەم، بەد شووم

**بیرازکردن**: تەخت و لووس کردنی زەوی، کون کون کردنی بەرادشی لووس بۆوەی دەنک باش بهاڕێ. لەو دەقەدا مانای یەکەم مەبەستە

بێژکردن: کوتن

**بێژە**: وێژە، ئەدەبیات

بێکەوشەن: بێسنوور

**پاپیرووس**: پاپیرووس یا قەرتاس جۆری سەرەتایی کاغەز بووە. پاپیرووس لە شیلەی گیایەک بە ناوی بووریا کە جۆرە جەگەنێکە ساز دەبێ. ئەو گیایە بە زۆری لە دەشتەکانی قەراخ چۆمی نیل رووا‌وە، بەرزاییەکەی ٢ تا ٥ میترە. خەڵکی میسری کەونارا زۆریان کەڵک لێ وەرگرتووە، بەڵام خەڵکی ناوچەکانی

مەدیترانە و بەشێک لە ئەورووپا و باشووری ڕۆژئاوای ئاسیاش کەڵکیان لێوەرگرتووە.

**پارادۆکسیکاڵ**: یەکێک لە گرینگترین جۆرەکانی دژوازی لە ئەدەبیات دایە. لیچ لە پێناسەی ئەو واتایەدا دەڵێ: پارادۆکس وتەیەکە کە دژوازی تێیدا ئەوەندە سەیرە کە مەجبوورمان دەکا بە شوێن واتایەکی ڕاستی لەوپەڕی وشەکانیدا بگەڕێین. لیچ پارادۆکس بە جۆرێک لادان لە نۆرمی مانایی دەزانێ و دەڵێ: لادانی مانایی لە نۆرم، لە باری لەفز و شکڵەوە بێ واتاییە، بەڵام ئەو ڕواڵەتە خوێنەر والێدەکا لەودیوی ئەو ڕواڵەتەوە لە واتا و تەعبیرێکی لە هەزر نزیک بگەڕێ. ئەو ڕاگواستنەی واتا لە شێعر دا ئەوەندە گرینگە کە شاعیر و ڕەخنەگران پێیان وایە تاقە شتێکە کە لە شیعر دا بە ڕاستی بە بایخە.

**حەرەکاتم سەکەنات و سەکەناتم حەرەکات**
**چوستە سستی، قەوییە زەعف و سەریعە کەسەلم**
**(نالی)**

**پاژنە**: پانیەی پا

**پاشقول**: پاشقل، پێ لە پێ پێچان لە زۆرەوانیدا

**پانتا**: مەیدان، پاناو، دەشتی پان و سەرڕاست

**پەریکلێس**:(٤٩٥-٤٢٩ ی پێش زایین) سیاسەتوان، وتاربێژ و شەرکەری شوێندانەر و ناسراوی ئاتێن بووە. ناوەکەی بە مانای "لە نێوان شانازی" دایە. ئەو لەبەرەی دایکەوە سەر بە بنەماڵەی ئالکامئوونی بووە کە خانەدانێکی دەست ڕۆیشتوو بوون. توسیدید مێژوونووسی هاوزەمانی خۆی ستایشی پلە و پایەی پەریکلیس دەکا و بەیەکەم شارۆمەندی ئاتێنی ناودەبا. ئەو ئاڵوگۆڕی بە سەر یەکیەتی دلۆس داهێنا و لە دوو ساڵی سەرەتای شەڕی پلۆپۆنزدا ڕێبەرایەتی خەڵکی لەسەرشان بووە. پەریکلێس پەرەی بە ئەدەبیات و هونەر دا و ئاتێنی کردە ناوەندی فێرکاری و کلتووری یوونانی کەونارا. ئەو پرۆژەیەکی بەرزەفڕانەی وەڕێخست و بینای زۆر گرینگی وەک پرنتۆن و ئاکرۆپۆلیسی ساز کرد. ئەو

پرۆژەیەی ئەو ئاتێنی رازاندەوە و شکۆی پێ بەخشی و هەوەها پیشەی بۆ خەڵک دیتەوە. ئەو زانایە خەڵکسەروەری ئاتێنی زیندوو کردەوە و هێندەی حەول و تەقەللا بۆ دا کە رەخنەگرانی ناوی پۆپۆلیستیان بە سەردا بڕی.

**پەیتا پەیتا:** لە سەر یەک، بێوچان، بەردەوام

**پواو:** رزیو

**پێچەڵاوپێچ:** پێچ دراو، پێچەڵپێچ، بریتییە لە زۆر دژوار

**پێخاوس:** بێ کەوش، پێپەتی

**پێشەنگ:** سەرجەلەی کاروان، زاراوە بۆ ئینسانی پێشڕەو کە خەڵکی دی وە دوای دەکەون

**پێشوێژی:** پێشبینی کردنی رووداوەکان، مەزەندەکردنی رووداوی داهاتوو

**پێگەیاندن:** بەخێوکردن

**پێل:** شەپۆلی ئاو

**تابشت:** تاقەت، هێز و تەوان

**تاتیانووس:** بە پێی سەرچاوە مێژوویییەکان ساڵی ١٢٠ی زایینی لە سووریا لە دایک بووە و ساڵی ٢٧٣ی زایینی کۆچی دوایی کردووە. سەفەری رۆمی کردووە و هەر لەوێش لەگەڵ ئایینی مەسیحی ئاشنا بووە. وەک خۆی دەڵێ بێزاری لە ئایینی موشریکانە، واتە ئەو ئایینانەی شەریک بۆ خودا دەبیننەوە منی بەرەو بابەتە ئایینییەکان هان دا. پاش خوێندنەوەی تەوڕات بڕوای بە ناعاقڵانە بوونی ئەو ئایینانە هێنا کە شەریکیان بۆ خودا دەدیتەوە، هەر بۆیە رووی کردە مەسیحییەت و بوو بە شاگرد و مریدی یوستینووس. تاتیانووس بە پێچەوانەی مامۆستاکەی هۆگرییەکی بە لێکنزیککردنەوەی بیری یۆنانی و ئایینی مەسیحی و یەهوودی نەبوو. ئەدەبی کلاسیک و بایخە ئاکارییەکانی یۆنانی بە گەندەڵ دەزانی و هزرمەندێتی یۆنانی رەت دەکردەوە و فەرهەنگی مەسیحی لە جێی ئەو دادەنا. تاتیانووس ئاوێتەیەکی ناڕوونی تاقانەپەرستی یەهوودی _مەسیحی، لەگەڵ واتاکانی رەواقی-نوێ ئەفلاتوونی لۆگووس پێکهێنا. تاتیانووس چەندین کتێبی

هەیە. یەکیان بە ناوی" لەمەبەستی چوارەم"دایە کە ئاوێتەیەکە لە چوار ئینجیل کە بەرودوا رەوایەت کراون. ئەو ئینجیلە بۆ ماوەی چەند سەدە لە سووریا برەوی هەبووە و سەدەی پێنجەم لەناوچووە. کتێبێکی تری بە ناوی "وتەیەک لە گەڵ یوونانییەکان" هەیە. ئەو کتێبەش بریتییە لە دمەقاڵە و جوابەجەنگی بیرمەندانی یوونانی و رووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ ئەندێشەکانیان. لەو کتێبەدا جیهانناسی مەسیحی و خوداناسی و تاقانەپەرستی مەسیحی لەگەڵ یەک هەڵدەسەنگێنێ و لەگەڵ خودایانی یوونانی پێکیان دەگرێ و ئەو تاقانەپەرستی و جیهانناسییە بە سەرتر و مەزنتر دەزانێ.

**تاریک و نووتەک**: زۆر تاریک، تاریکایی خەست و توند

**تاقەت**: هێز و توان، تابشت

**تاک و تەرا**: بە دەگمەن، تاک و تووک

**تاڵووکە**: پەلە، لەز

**تانوپۆ**: راهێڵ و تێوەدان

**تەگەر**: تایە، چەرخی سەیارە

**تەگەرە**: کۆسپ و لەمپەر

**تەیار**: ساز و ئامادە بۆ کار یا سەفەر

**تووڕدان**: تووڕ هەڵدان، بۆ دوور هاویشتن، فڕێدانە دوور

**توێژبەردان**: توێخ بەردان

**تۆزقاڵ**: تۆزوولکە، نەختووکە، کەمترین ئەندازە

**جسن**: چەشن، ریشە و رەگ، رەگەز بۆ ژن یان پیاو

**جەزرەبە**: ئازار، ئەزیەت، عەزیەت

**جەگەن**: گیایەکە لاسکی سێ سووچە و لە گۆلاودا دەڕوێ

**جوانوو**: جانوو، بێچووە ئەسپ و ماین

**چارۆکە**: قوماشێکە ژنان بەسەر شانی دادەدەن

**چاونزێر**:چاو لەدەست، بە ئێرەیی، چاوچنۆک، تەماح کار_لەو دەقەدا مانای یەکەم مەبەستە

**چرای گڕسۆز**: جۆرە چرایەکە بۆ رووناکی

**چڵپاو**: قوڕ و لیتە، خۆڵی تەڕ، هەڕی

**چەپەر**: پیاوی نامەبەر، تەتەر

**چەتوون**: زەحمەت، چەتن، ناڕاست و تووش

**چەق**: ناوەندی ڕێگە

**چەقی میحراب**: ناوەندی میحراب

**چەکمە**: جزمە، جەزمە، کەوشی تا ئەژنۆ

**چێرەیی**: رەنگی ئاڵی کاڵ، پەمەیی

**چینە**: هەڵگرتنەوەی دەنک بە دندووک

**حاسڵات**: بەهرە و دەرامەد

**حەجمین**: حاوانەوە، ئارام گرتن

**حەشامەت**: ئاپۆرە، حەشیمەت

**حەیزەران**: دارێکە لە شوێنی گەرم دەڕوێ و لە قامیشی ناوپڕ دەچێ

**خاڵیگە**: کەلەکە، قەبرغە

**خڕ و دۆڵ**: جێ لافاو، ئاودڕ

**خڕ**: ئاودڕ، جێ لافاو،

**خڕکە بەرد**: بەردی پڕ بە مشت، زیخی درشت

**خشۆک**: خشندە، ئەوی بە زەویدا دەخشێ، ئەوی بە خزین دەڕوا

**خەندەک**: خەرەند، قووڵکەی درێژی لە زەمیندا هەڵکەندراو

**خیز**: زیخ، چەو

**خێوەت**: چادر، خەیمە، کۆن

**داربەست**: دار لێکدان بۆ سیمان تێکردن، داربەس، داربەستی بەننایی

**داڵدە**: پەنا

**دامێن**: بنار، دامێنی کێو

**دانوستان**: مامڵەکردن، کڕین و فرۆشتن، وتوویێژ و ئاڵوگۆڕی بیرو را_ لەو دەقەدا مانای یەکەم مەبەستە

**درۆشە**: درێشووکە، زمانی مار

**دژوازی**: جۆری پێوەندیی دوو شتی دژ بەیەک

**دڵەڕاوکێ**: دوودڵی، نیگەرانی

**دەربیجە**: دەلاقە

**دەریای ئێژە**: یەکێکە لەو دەریایانەی دەوراندەوری مەدیتەرانە و لە مابەین شێوەدوورگەی یۆنان و ئاناتوولی هەڵکەوتووە و لە ڕێگەی ئاودڕی داردانێل و بۆسفۆڕ لەگەڵ دەریای مەڕمەڕە و دەریای رەش تێکەڵ دەبێتەوە.

**دەست داشتن**: دەست شوشتنەوە لە شتێک یان کەسێک

**دەفتەری رێنوێن**: دەفتەرێک کە ناو یان ژمارەی تەلەفوون و نیشانەی کەس و دایرەکانی تێدا تۆمار کرابێ، هەر دەفتەرێک کە رێنوێنی کەسەکان بکات بۆ وەدەست هێنانی زانیاری لەمەڕ خەڵک و شوێنەکانی دیکە

**دوڕڕە**: دوو تۆمە، دوو رەگە

**دێراو**: زەمینی چاڵکراو بۆ ئاو داشتن

**دیناو**: ناسینی ناخەکی، شهوود

**راپەڕاندن**: کار پێکهێنان، ئازایانە کار ئەنجامدان

**راسان**: بەرز بوونەوە، دەست بەرز کردنەوە بۆ هەڕەشە، بۆ کەسێک دەکار دەکرێ کە بە مەبەستی هەڕەشە دەست بەرز دەکاتەوە، زاراوەیە بۆ راپەڕین، بۆ مانای یەکەم(لێی رادەسێ و زللەیەکی لێدەدا)، بۆ مانای دووهەم(راسانی گەل واتە نەمانی دوژمن) لەو دەقەدا مانای یەکەم مەبەستە

**راشکان**: تێپەڕێنی بەشێک لە شەو

**رازان**: خەوتن، راکشان

**راستۆکی**: بێ درۆ بوون، سەداقەت

**رانە مەڕ**: مێگەلە مەڕ

**راوێژ و بێژە**: دەراوی دەم و ئەدەبیاتی کەسێک، شێوەی دوان و ئاخافتن

**رقەبەری**: بەربەرەکانی کردن، رەقابەت کردن، حەولدان بۆ وەپێشکەوتن

**رکە**: قەفەز

**رکێف**: ئاوزەنگی، زەنگۆ

**رمب**: رم، نێزەی درێژ

**رەمەکی**: ئاسایی، عادەتی، زاراوەیەکە بۆ کاری فشە و سەرسەرەکی

**رەنگ و سەنەمە**: پێ و قەدەم، سەر و سەکوت، سەر و سیما

**رەوە**: لە ئەسڵدا کۆمەڵی ئەسپ و ماینی شەو بە کێو، کۆمەڵی هەر حەیوانێک

**رووخەک**: نزیک بە رمان، لە سەر رووخان

**رۆح**: کانزایەکە نەرم

**رێ و شوێن**: باوی ناو کۆمەڵ، دەستووری کار

**ریخ**: رەم، شیاکە

**زاخاودان**: قایم کردن بە زاخ

**زاوزێ**: بێچوو بە دنیا هێنان، زاوزو

**زریڤانی**: کارکردن لە سەر دەریا

**زمرووت**: گەوهەرێکی بە نرخی زۆر کەسکە

**زەبەللاح**: زلحۆرت، تەژەی ناقۆلا

**زەمبیلە**: قەرتاڵە

**زەنا زەنا**: ژاوە ژاو، هەرا و گورەی زۆر

**ژام**: چام، زەنگی کلیسا

**ژامکوش**: مجێوری زەنگی کلیسا

**ژاوەژاو**: زەنا زەنا، هەرا و گورەی زۆر

**سپیدار**: ئەسپێندار، سپیە چنار

**سلۆک**: سرک، رەوەک

سەر بە گۆم دا کردن: لەبەین بردن
**سەربەمۆر:** دەست لێ نەدراو
**سەربوردە:** سەربردە، سەربووری، بەسەرهات، سەرگوزەشتە
**سەردوولکە:** شینگێڕی، مەرسییە، لاواندنەوەی مردوو بە بەیت و باو
**سەردوولکەوێژ:** کەسێک کە مردوو بە بەیت و باو دەلاوێنێتەوە
**سەرشین:** پیرەش و شووم، بە ژنی پیرەش و شووم دەڵێن
**سەرو:** دارێکی راست و بێبەر و گەڵا دەرزییە
**سەوڵ:** سەڵپ، بێڵی ئاژووتنی گەمی
**سووتمان:** ئاگر بەربوونەوە
**سۆفیلکە:** ردێنداری چکۆلە، بریتییە لە ردێنداری بە پارێز
**سۆلۆن:** کاربەدەست، یاسادانەر و شاعیری کارامەی ئاتێنە. بە باوکی شاری ئاتێن ناسراوە. حەولی دا لەبەرانبەر سیاسەت و یاسا و ریسا ئاکارییەکانی پێشووی ئاتێندا راوەستێ و یاسای نوێ دابمەزرێنێ. ئەگەرچی زۆربەی ریفۆرم و چاکسازییەکانی ئەو پاش خۆی لەناو چوون، بەڵام رۆڵی ئەو لە دارشتنی بناخەی خەڵکسەروەری ئاتێندا ئیعتبار و حورمەتی بە سۆلۆن بەخشیوە. یوونانییەکان بە یەکێک لە حەوت زانای ناوبەدەرەوی خۆیانی دەزانن.
**سیاسەتوان:** بەرێوەبەری سیاسەت، سیاسەتمەدار
**سیپەگرتن:** بۆسە گرتن، بۆسەی راوکەر
**سێروو:** رەشوولە: ریشۆڵە، گاوانی
**سیسرە:** سفرەبڕ، جانەوەرێکە لە تیرەی کلۆ رەشە لە مەزرایە زیرەی دێ
**شارۆمەند:** هاوولاتی
**شان هەڵنەگرتن:** لە شان دا نەبوون، دەعیە نەهێنان
**شان و باهۆ:** شان و پیل، دیمەنی لای سەرووی لەش
**شەبەقی بەیانی:** رۆشنایی ئاسۆ، تیشکی سەرەتای هەتاوی بەیانی
**شەپۆڕ:** گریانی بە دەنگ بۆ مردوو

**شەقڵ**: مۆر

**شەنە**: داری چوار چنگی خۆیان بە با دان، شەن

**شەودەر**: شەبدەر، گیایەکە

**شەونخوونی**: شەوبێداری، بە شەو نەخەوتن

**شووالییە**(Chevalier): شۆڕە سوار. لە راستیدا نازناوێکی فەڕانسەوییە و لە ناوی ئەسپ(Cheval)ی فەڕانسەوی وەرگیراوە. هاوتای وشەی ئینگلیسی (Knight) بە مانای شاسوارە. شووالییە پلەیەکی تەشریفاتی بووە و لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا برەوی بووە. ئەو نازناوە ئێستا جگە لە بریتانیا لە هیچ کوێیەک کەڵکی لێ وەرناگیرێ. لە جیهانی ئێستاشدا ئەو نازناو و پلەیە لە لایەن فەرمانڕەوای بریتانیاوە وەک نیشانەی شانازی بەو کەسانە دەبەخشرێ کە دەستکەوت و شانازی بەرچاویان بۆ بریتانیا و جیهان وەدەست هێنابێ.

**شوورەی چیمەنتۆی هەوربڕ**: دیواری سیمانی زۆر بەرز

**شۆرەکات**: شۆرەزار، شامات، زەوی بێ حاسڵی سوێر

**شێری گوڕیو**: شێری توورە کە دەگوڕێنێ

**شیناوەرد**: سەوزایی زەمین

**عەیش**: خۆش گوزەرانی، خۆش رابواردن

**غەریزە**: سرشتی گیانلەبەران بۆ خواردن و ڕاوکردن و بێچوو حاواندنەوە و جووتبوون و شتی لەم دەستە

**غەڵتەک**: ئامراز یا مەکینەیەکی قورسە بۆ کوتانەوە و بیراز کردنی ڕێوبان

**غەیان**: خاین، کەسێ خەیانەت بکا

**غوڕابی خەو**: خەوی قورس، شیرنە خەو

**فۆتۆریسم**: فۆتۆریسم یان داهاتووڕوانی یەکێک لە بزووتنەوە هونەرییەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم بوو. ناوەندی سەرهەڵدانی ئەو بزووتنەوەیە ئیتالیا بوو و هونەرمەندانی رووسیاش بەرە بەرە روویان تێکرد. فۆتۆریستەکان لە بواری جۆراوجۆری وەک ئەدەبیات، نیگارکێشی، پەیکەرسازی، سواڵەتسازی، شانۆ،

مووسیقا، میعماری و تەنانەت ئاشپەزی‌دا چالاکی‌یان دەنواند. فلیپۆ توماسۆ مارینێتی بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەی فۆتۆریسم لە ساڵی ١٩٠٩ و لە رۆژنامەی فیگارۆدا، بە فەرمی چالاکی ئەو بزووتنەوەیەی راگەیاند. لەو بەیاننامەیەدا نووسیویانە کە فۆتۆریستەکان لە هونەری رابردوو بێزراون و کەڵکەڵەی سەرەکی ئەوان بزووتن و خێرایی و تەکنۆلۆژیایە. بۆ فۆتۆریستەکان ماشین، فڕۆکە و شارە پیشەسازی‌یەکان، نیشانەی زۆر گرینگ بوون، چونکە هەر کام لەوانەیان بە نیشاندەری زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر سروشتدا دەزانی. داهاتووڕوانی نیگایەکی یاخی‌بووانەیە بۆ مێژوو و دیاردەکانی ژیار و لە بەیاننامەی خۆیاندا رایان لە سەر لە ناوبردنی دیاردەکانی ژیارە و ستایشی رواڵەتەکانی مودێڕنی ئینسانی دەکەن. ئەوان خوازیاری لەناوچوونی مۆزەخانە و کتێبخانە و شتی لەو بابەتە بوون کە نیشانەکانی رابردوو و ژیاری پێشوویان لە خۆیاندا راگرتبوو، هەر بەو هۆیە بزوتنەوەی فۆتۆریسم بوو بە یەکێک لە ریشەکانی سەرهەڵدانی فاشیسم لە ئیتالیا. هونەرمەندەکانی فۆتۆریست جەختیان لە سەر یەکبوونی نیگارکێشی و بینەر دەکرد و دەیان گوت: دەبێ بینەر لە ناوەندی نیگارکێشی‌دا جێ‌بگرێ تا تێگەیشتنێکی کۆمەڵایەتی سەرسوڕهێنەر لە دەروونی نیگارکێشی ئەو شێوازە وەدەست بێنێ." ئەو بابەتەش بووە هۆی بەدی‌هاتنی روانگەی ماشینی و مودێڕن سەبارەت بە نیگارکێشی. ئەوان زۆریان گرینگی بە دۆزینەوە زانستی‌یەکان دەدا و لە سەر بزووتن لە نەقاشی‌دا جەختیان دەکرد و هەر ئەوەش بووە هۆی بە دیهاتنی ئەنیمەیشن یان نیگارکێشی بەجووڵە.

**قاشوولکە**: وردکە سواڵەت و چینی

**قشتیلە**: خونچیلانە، چکۆلەی خوێن شیرین

**قەڵا و باڵەخانە**: قەڵا و ماڵی بەرز، قەڵا و کۆشکی دوو نهۆم

**قەڵاچۆ**: قڕان تێ‌خستن، لەناوبردن

**قەننە**: سەبیلەی کلک درێژ، قەندە، باس قەنە

**قەوزە**: جلە شینەی سەر ئاو

**قوڕ و چلپاو:** قوڕ و لیتە، گڵی تەڕ

**کاتۆلووس:** بوێژی بە توانای ڕۆمی و یەکێک لە هۆنەرانی بەرزی مێژووی ئەدەبی جیهانە. کاتۆلووس ساڵی ٨٤ی بەر لە زایین لە "وروونا" لە دایک بووە و ساڵی ٥٤ی بەر لە زایین لە ڕۆم کۆچی دوایی کردووە. شیعری عاشقانەی کاتۆلووس و دەربڕینی ئەوین و نەفرەتی ئەو لە شیعردا نموونەی هەرە باشی غەزەلی ڕۆمی پێکدێنێ. کاتۆلووس ٢٥ شیعری بەرزی هەیە و تێیان دا ئەوینی خۆی بۆ ژنێک بە ناوی "لێزبیا" دەربڕیوە. باقی شێعرەکانی هەجو و جنێوە شێعرە کە بۆ زەممی "ژۆلیۆس سێزار" و کەسایەتییەکانی دیکە نووسیویەتی.

**کارئاسک:** بەچکە ئاسک

**کاژ:** داری کاج

**کاڵە:** پێتاوی لە چەرمی خاو، کاڵک، کلاش

**کەپر:** خانووچکەی لە شووڵ و قامیش

**کەپرۆچکە:** کەپری بچووک، خانووچکەی لە شووڵ و قامیش ساز کراو

**کەپەنک:** فەڕەنجی

**کەلاوڕێژ:** ڕژانی ئاو لە گۆل بە پڕی

**کەڵەوەکێش:** سەرسەخت، کەسێک کە بە قسەی کەس نەکا، زاراوەیە بۆ مرۆڤی یاخی

**کەلێن و پەسیو:** قەڵەشت و پەنا، سووچ و قوژبن

**کەند و لەند:** شوێنی پڕ چاڵ و چۆڵ و بڵیندایی و نەویایەتی، زاراوەیەکە بۆ گرفت و چەرمەسەری

**کەونارا:** کۆن، لە مێژینە، کەون

**کوانوو:** ئاگردان، تفک

**کوچکاور:** سێ بەردەی ئاگردان

**کوسووف:** ڕۆژگیران

**کۆشکی خەوەڕنەق**: ناوی کۆشکێک بووە کە نوعمان حاکمی حیرە، بۆ پاشای خۆی واتە؛ یەزدگێردی یەکەمی ساسانی ساز دەکا. ئەو کۆشکە لە نزیک یەک مایلی رۆژئاوای شاری نەجەف لە نێوانچۆمان هەڵکەوتووە. شاعیرانی چامەنووسی عەرەبی بەر لە ئیسلام، ئەو کۆشکەیان وەک یەکێک لە سێ شتی سەیر و سەرسوڕهێنەری جیهان ناودێر کردووە. ناوی خەوەڕەنەق ناوێکی ئێرانییە و لە ئەسڵدا "هووەرنە" واتە "خاوەن میچی جوان"ە. سینیمار ناوی یوونانی ئەو میعمارە رۆمییە بوو کە کۆشکی خەوەڕنەقی بە ئەمری نوعمانی کوڕی ئەمرئەلقەیس ساز کرد. سێنیمار رۆژێک بەر لە کرانەوەی فەرمی کۆشکی خەوەڕنەق لە کاتێک دا کە خەریک بوو بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆشکی نیشان نوعمان دەدا، کە دەگەنە سەربانی کۆشک، بە دەستووری پادشا بە هۆی سیڕڕێک کە لە سازکردنی ئەو کۆشکەکەدا دەکار کرابوو، هەروەها بە هۆی ئەوەی پادشاش نەیدەویست ئەو سیڕڕە کەس بیزانێ، لە سەربانی کۆشک را تووڕی هەڵدەدەنە خوارەوە.

**کووڕ**: پشتی چەماو، سەربەروژووری سەخت

**کووزوو**: کووپەڵەی مل باریک

**کۆتوبەند**: ئەوە ئامرازەی زیندانیی پێ دەبەستنەوە

**کۆنەی منداڵ**: پەڕۆی کۆن کە لە منداڵەوی دەپێچن

**کۆنینەناس**: پسپۆڕی ناسینی مێژووی کۆن

**گاشە بەرد**: بەردی زل، گابەرد

**گاڵەدران**: داخران

**گرویێی**: نەخۆشی دەردی گرۆ، ئاوڵە، کون کون بوونی دەموچاو

**گنج**: چرچ

**گەمی**: کەشتی، پاپۆڕ

**گەمیوان**: کەسێ کە کەشتی دەئاژوێ

**گەی بە گە**: بەند بەندی ئێسقان،

**گورچووبڕ**: زەبری قورس

**گووران**: رەگ داکوتان، رووان، رسکان

**گوێچکەماسی**: سەدەفێکە لە دەم بەست و رووباران دەبیندرێ

**گۆئەستێرە**: گوڵئەستێرە، ئەستێرۆک، کرمێکە شەوانە دەتروسکێتەوە

**گیانەڵلا**: دەمی ئاویلکەدان، دەمە دەمی رووح دەرچوون

**گێژوا**: گەرداو، گێژاو

**لاپ بە دڵ بوون**: زۆر بەدڵ بوون

**لالانەوە**: پاڕانەوە

**لغاو پساو**: دەسکە جڵەو هەڵبڕاو، دەسکە جڵەو لەت کراو، زاراوەیە بۆ ئینسانی بێحەیا و یاغی کە گوێ نەداتە یاسا و رێسا

**لمبۆز**: پۆز، دەم و لووتی حەیوان

**لەسەرخۆچوون**: بێهۆش کەوتن، ناوشیار بوون

**لەعل**: بەردێکی بەقیمەتە، لاڵ

**لەئەلفەوە نەهاتنە بێ**: متەق نەهاتن، قسە نەکردن، هیچ نەکوتن

**لوول خواردن**: بادران، تێکهالان

**لێزبۆس**: دوورگەیەکی یۆنانییە و لە دەریای ئێژەدا هەڵکەوتووە. وشەی لێزبین کە بۆ ژنانی هاوجسنخواز دەکار دەکرێ لە ناوی ئەو دوورگەیە وەرگیراوە، چونکە شوێنەزای سافۆ شاعیری سەدەی حەوتەمی بەر لە زایینە و ئەو شاعیرە لە شێعرەکانیدا ئەوینی نێوان ژنانی ستایش کردووە. ئەو دوورگەیە کە شوێنی لە دایکبوونی سافۆیە، ئێستاکە لە شوێنە گەشتیارییەکانی یۆنانە و زیاتر ژنانی هاوجسنخواز بۆ سەیران رووی تێدەکەن.

**لێکالانەوە**: لێهاتن، رێککەوتنی دووشت، لێجوانبوون

**لێوەشاوە**: لێهاتوو، شایستە، شیاو

**ماکە**: هەر رەگەز و بنچینەیەک کە شتی لێ پێکهاتووە، هۆی دروست بوون

**ماڵی کەوان**: مابەینی هەردووک سەری کەوان

**مجری**: سندووقی چکۆله

**محاڵ**: ناوچه

**مەتاڵ**: قەڵغان، سپەر

**مەتەرێز**: سەنگەر، خەل

**مەزرای بەراو**: زەمینی ئاوی، زەمینێک ئاو بدرێ

**مەڵحەم**: دەرمانی له برین ساوین، مەڵهەم

**مۆرکە**: مۆرانەی خوری خۆر، جانەوەرێکە

**نابووتە**: پیسەکە، قرخنە، پووتەکە

**نەبەدی**: پێوار، نەدیار، نە لەبەرچاو

**نەخشە**: شکڵی وڵاتان له سەر کاغەز، خەریتە

**نەشتەر ئاژن**: بە نەشتەر کوتراو، بە نەشتەر کون کون کراو

**نەقوستان**: ناقیس، کەمئەندام

**نیسابا**: خاتووخودای نووسینه له ئوستوورەکانی یوونانیدا

**نێوانچۆمان**: مەودای نێوان دوو چۆمی دیجله وفووڕات، بەینولنەهرەین

**هاوجسن خواز**: جۆرێک ویستی تایبەته که ئەوین و هەست و تەمای ژنان و پیاوان بۆ هاوجسنی خۆیان نیشان دەدا. ئەو ژن و کچانەی هەستێکی وایان هەیه به لێزبین ناسراون.

**هرووژم**: پەلاماری به توندی

**هەتەر**: مەودای حوکمی چاو

**هەفتپەیکەر**: یەکێکه له شاکارەکانی شێعری "نیزامی گەنجەوی" شاعیری گەورەی ئێرانییه. ئەو کتێبه له باری پێکهاته و ڕەوتی چیرۆکییەوه له دوو بەشی جودا پێکهاتووه. بەشی سەرەتا و کۆتایی، باسی ئەو ڕووداوانەیه که پێوەندییان به بارامی پێنجەمی ساسانییەوه هەیه و له ڕۆژی له دایکبوونەوه تا مەرگی ئەو پاشایه دەگرێتەوه. ڕەوتی ئەو بەسەرهاته به پێی گێڕانەوەیەکی مێژوویییه. بەشێکی دیکەی ئەو کتێبه بەشی ناوەڕاستییەتی که له حەوت حیکایەت پێکهاتووه

و ئەو حەوت حیکایەت یان حەوت ئیپیزۆدە لە زمان حەوت ژنی ئەوەوە سازکراون و حەوت کچی پاشای حەوت ئیقلیم (بە پێی دابەشکاری پێشینیان) بۆ بارامی دەگێڕنەوە. ئەو مەنزوومەیە ئاوێتەیەکە لە لایەنی حیماسی و لایەنی غەنایی. بەو واتایە کە بەشی حەوت گومبەز بە تەواوی خاوەن ناواخن و رووحێکی غەنایی و رۆمانتیکە، بەڵام لە بەشە مێژووییەکەی دا ئەگەرچی شاعیر ویستوویەتی روخسارێکی حەماسی بۆ بارام دابڕێژێ، ئاوێتەیەکە لە لایەنی حەماسی و ئەویندارانە.

لە حەوت پەیکەردا زەمین و ئاسمان و تروسکەی جوانی ئەو دوانە پێک دەگەن: لە لایەک حەوت گومبەز لە سەر زەوی سازکراوە و حەوت رۆژ و حەوت رەنگ و حەوت ئیقلیم و حەوت بووک کە هەموویان سەر بە زەمینن لە سەر زەوی نیشان دراون، لە لایەکی دیکەوە هاوسان دانانی ئەو حەوتانە لەگەڵ حەوتە ئاسمانییەکان و لەبەر یەک رانانیان وەک (حەوت هەسێرە و حەوت فەلەک) و رێگەی پێوەندی ئەو دوو حەوتانەش گومبەزێکە بە خول خوارن بەرەو سەر نەخشێندراوە و مەبەستی ئەوەیەتی بەرەو گومبەزی خڕ و لەگەڕ وەسەر کەوێ.

**هەڵاڵە:** ماکی مۆم کە مێشەنگوین لە گوڵی دەگرێ

**هەڵکەوتە:** بێوێنە، بەرکەتی

**هەڵەداوان:** پەلەی زۆر

**هەڵەنگووتن:** سەرەنگرێ بوون

**هەڵوەهەرزە:** خراپەکار، ژنی بەدکار

**هەڵوارتە:** تایبەت، تاق خراوە، ئیستیسنا

**هەنگامە:** هەراوهوریا

**هەوربڕ:** زۆر بەرز

**هێماخوازی:** دەربڕینی بە ئیشارە و رەمزاوی

**وچان گرتن:** پشوودان

**وەپشت گوێ خستن:** گوێ پێ نەدان، فەرامۆشکردن

**وەشاندن:** بڵاوکردنەوە

**ولادیمێـــر مایاکۆفســـکی:**(١٨٩٣_١٩٣٠) شـــاعیر و شانۆنووســـی فۆتۆریســـتی رووسی، لە ئاوایی بەگداتی گورجستان لە دایک بووە. بە هۆی کاریگـەری شێوازی نووسـینی، بـە یـەکێک لـە هەڵکەوتـە دەگمەنـەکانی هونـەری رووسـییەی دەزانـن. مایاکۆفسکی لە شـێعری رووسـیدا کێش و لـەفز و دەسـتەواژە و خـوازەی تـازە و بێوێنـەی بـەدیهێنـاوە. ئـەو بـە درێژەدانـی شـێوازی فۆتۆریسـتی داهاتووخوازنـە بەرهەمەکانی دەخولقاند، بەڵام هەموو یاساورێسـاکانی ئـەو شـێوازەی لـە بـەر چاو نەدەگرت و شـێوە نووسـینی تایبـەتی خۆشـی لـە بـەر چـاو بـوو. مایاکۆفسـکی هـیچ کەرەسە و شێوەیەکی بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕای خۆی بە عـەیب‌وعار نـەدەزانی و تەنانـەت لـە کۆڵانـەکاندا پیاسـەی دەکـرد و شـێعری بـۆ خـەڵک دەخوێنـدەوە. مایاکۆفسـکی ئـەدەبی هـۆنراوە و شـێعری لەگـەڵ راسـتی‌یـەکانی ژیـان لێـک نزیـک کـردەوە و ئـەو هونـەرەی بـۆ خزمـەتی پێداویسـتی‌یەکانی هاوچـەرخ بـەکارهێنا و وەک چەکێک بۆ بەربەرەکانی لە رێی گەیشـتن بـە ئامانجـەکانی کـەڵکی لێ‌وەرگرت. ئەو شێعری کلاسیکی پێ‌خۆش‌بوو بـەڵام ملکەچی نـەدەبوو و دەیکـوت: "هونـەر دەبێ لەگـەڵ ژیـان ئاوێتـە بـێ. یـان دەبـێ ئاوێتـە بـێ و یـان دەبـێ تێـک بڕووخـێ." مایاکۆفسـکی سـاڵی ١٩٣٠ بـە گوللـە خـۆی کوشـت. هۆکارەکەشـی دەگەڕێننـەوە بـۆ ناکـامی لـە ئـەوین لـە لایـەک و بەربەسـتکردنـی سـەفەری دەرەوەی لـە لایـەن حکوومەتـەوە. بـەر لـە مـەرگی، لـە سـەر لاپەڕەیـەک ئـەو رسـتەیەی نووسـیوە."....بۆ هـەمووان دەمـرم..." مەیتەکـەی لـە گۆڕسـتانی گـەورەکانی شـۆڕش دا نێژراوە. لـە یەکیـەتی سـۆڤیەتی پێشـوو، ئـەویان بـە گـەورەترین شـاعیری سـەردەمی شـۆڕش دەناسی.

**ویرە:** گۆرانی لە بن لێوەوە

**وێناکراو:** نەخش کراو

**یەخسیر:** ئەسیر، دیل

## سەرچاوەکان:


١- آخماتوا، آنا(١٣٧٧)خاطره‌ای در درونم است، ترجمه احمد پوری، تهران: نشر چشمه

٢- آخماتوا، آنا(١٣٩١)آنا آخماتوا؛ شاعری در مسیر بادها،مجله الکترونیکی سیمرغ

٣- آبادپور، آیدا(١٣٨٦)آیین زرتشت _ نشست دهم: سرای سرود و سرای دروغ، کانون پژوهشهای ایرانشناسی

٤- اتود، مارگارت(١٣٩١)ترجمه سه شعر از مارگارت اتود، مترجم گلاره جمشیدی(http://shaeraneha.com/gelareh

٥- بیلیتیس(١٣٩١)ترجمه سه شعر از بیلیتیس، مترجم یاسمین حمشدری، سایت رویانز

٦- بیلیتیس (١٣٢٩)ترانه‌های بیلی‌تیس، ترجمه شجاع‌الدین شفا، تهران: آثار جاویدان

٧- بیکل، مارگوت (١٣٦٥)چیدن سپیده دم، ترجمه آزاد و اجرای اشعاری از مارگوت بیکل توسط احمد شاملو و محمد زرین‌بال، نشر ابتکار

٨- بیکل،مارگوت (١٣٨٢)عاشقانه‌هایی که من دوست می‌دارم، ترجمه ندا زندیه، انتشارات دارینوش (تهران)، ،

٩- بیکل، مارگوت (١٣٨١) فرشته‌ای در کنار توست، ترجمه: ندا زندیه، ویرایش: یغما گرویی،تهران: انتشارات دارینوش

١٠- بیکل، مارگوت (١٣٦٥) سکوت سرشار از ناگفته‌هاست، ترجمه آزاد و اجرای اشعاری از مارگوت بیکل توسط احمد شاملو و محمد زرین‌بال، نشر ابتکار

١١- تسوه تایوا(١٣٨٠)گزینه اشعار ،ترجمه فریده حسن‌زاده، تهران:انتشارات نسیم دانش

١٢- تسوه تایوا،مارینا(١٣٨٠)شاعر برگزیده قرن بیستم، ترجمه فریده حسن زاده، مجله شعر، شماره ٢٩

١٣- حسن‌زاده، فریده(١٣٨٣)شعر زنان جهان، تهران: انتشارات نگاه

١٤- حالت، ابولقاسم(١٣٥٦)بهتر از همه، ترجمه‌ی یکی از ترانه‌های بیلیتیس شاعره‌ی یونانی، مجله گوهر شماره ٥٦

١٥- خاڵ، شێخ محەمەد(١٩٦٤)فەرهەنگی خاڵ، سلێمانی:چاپخانەیکامەران

١٦- دواچی، آزاده،(١٣٩١)نگاهی به تصویر زن در اشعار مایا آنجلو ، مجله الکترونیکی نصور

١٧- دیکنسون امیلی(١٣٧٩)به خاموشی نقطه‌ها، ترجمه سعید سعیدپور، تهران:مروارید

١٨- سافو شاعره‌ی یونانی دوران باستان، ترجمه علی عبدالهی، مجله نافه، شماره٢٦، ص٤٩-٥١

١٩- سافو نخستین زن شاعر، ترجمه پیرایه یغمایی، برگرفته از کتابwomen poems، ص٤١-٤٢

٢٠- سودرگران، ادیت(١٩٩٩)سرزمینی که وجود ندارد، ترجمه نامدار ناصر، ناشر: Nordient،Goteborg

٢١- سیدحسینی، رضا(١٣٨١)مکتب‌های ادبی،تهران: نشر نگاه

٢٢- پلات،سیلویا(١٣٨٤)در کسوت ماه، ترجمه سعید سعیدپور،تهران:نشر مروارید

٢٣- شیمبورسکا، ویسواوا (١٣٧٦) آدمها روی پل، ترجمه مارک اسموژنسکی-شهرام شیدایی-چوکا چکاد، تهران: نشر مرکز

٢٤- شیمبورسکا،ویسلاوا(١٣٩١)شعر و زندگی شیمبورسکا، ترجمه محمد حسین بهرامیان، سارا شعر

٢٥- شعر: سیاه زخم(یک روایت از زندگی مایا انجلو)ترجمه محمد رضا فرزاد، مجله گلستانه

٢٦- شرفکندی، عبدالرحمان(١٣٧٦)هەنبانە بۆرینە، چاپی دووهەم، تهران: انتشارات سروش

٢٧- عاشقانه‌هایی که من دوست می‌دارم(١٣٨٢)، ترجمه ندا زندیه، تهران: انتشارات دارینوش

٢٨- فالکن‌لند،کریستین(١٣٩٠)معرفی و ترجمه منتخب اشعار کریستین فالکن‌لند،ترجمه سهراب رحیمی((http://www.vazna.ir/?p=٢٧٥))

٢٩- فرخزاد،فروغ(١٣٩١)نامه ای از فروغ به مجله فردوسی،(با اشاره به بیلیتیس) http://irwomen.blogfa.com/post/8

٣٠- فرهنگ اندیشه‌نو(1369) ترجمهٔ گروه مترجمین. ویراستار ع. پاشائی. تهران: انتشارات مازیار

٣١- گرازینک‌هانس،هانا(١٣٩١)گزیده شعر گرازنیک، ترجمه احترام سادات توکلی، مجله الکترونیکی وازنا

٣٢- مومنی، خورشید(١٣٨٢)میان‌رودان، تمدن سومری و کهن‌ترین شعر گیتی،مجله چیستا٢١٤

٣٣- مختصری درباره سافو، ترجمه علی ثباتی، برگرفته از دایره‌المعارف بریتانیکا،(www. vazna. com)

٣٤- موحد، ضیاء(١٣٧٧)شعر و شناخت، تهران، انتشارات مروارید

٣٥- نوری‌زاده، احمد(١٣٦٩) صد سال شعر ارمنی، تهران: نشر چشمه

٣٦- هنرمند، سعید، کهن‌ترین شعر دنیا، ایانا بانوی بزرگ‌ترین قلب، مجله بخارا، بی‌تا

٣٧- همچون کوچه‌ئی بی‌انتها(١٣٧٦)گردآوری و ترجمه احمد شاملو، چاپ چهارم، تهران:انتشارات نگاه

38- (http://pajuhesh-iranshenasi.blogfa.com/post-34.aspx)

39- www. mesyeux. blogfa. com

40- www. iranseda. ir

41- www. shabestan. ir

42- http: //ketabeshear. com/Tazeh/sohrab-dec. htm

43- www. vazna. com

44- http: //ketabeshear. com/Tazeh/sohrab-dec. htm

45- http://www.sacred-texts.com/cla/sob/index.htm

46- 3٨http://shaeraneha.com/gelareh/-

47- 3٩http://sarapoem.persiangig.com/link7/t41.htm

48- http://www.noormags.com/view/fa/articlepage

49- ٨٠html ١٣٩٠.٠٢.١٩ / http://royanz.com /